ێناسی کتێب

اوی کتێب : خەونامەی کوردی

ۆکرنەوەو وەرگێرانی : عبدالسلام محمد نبی

ۆبەتی چاپ : چاپی ئەشەم

ونێنی چاپ : چاپخانەی گەنج

یراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە

قم الایداع في المكتبة الوطنية بغداد ( ١٣١٩ ) لسنة ١٩٨٥

پێشکەش بەو کەسەی کە لە ڕووی ڕاستی و تاقی کردنەوە ئەنوارێتە ژیان و بەرنامەی ژیان بە تەرزاووی ڕاستی دەکێشێ:

دانەر عبدالسلام محمد نبی خۆشناو

کۆکردنەوە و وەرگێرانی.

عبدالسلام محمد نبی خۆشناو. بێتوانە:

پێشکەش بە گیانی پاکی پیری خەراباتی شەرابی

یەزدانی .. مەولانا خالیدی کوردی:

بە گیانی ڕووناکی مەستی سروشە دلپاکانی کۆڕی

مەیخانەی خواپەرەستی:

مەلا حەیدەری کوردی ماوەرانی:

بە گەلی کوردی تێکۆشەری ڕێبازی خواپەرستی و

پارێزەری ئایینی ئیسلامی پیرۆز لە هەموو ـ ..

عبدالسلام محمد نبی: خۆشناو

اذ قال يوسف لأبيه يا أبتي اني رأيت أحد عشر كوكبا والشمس والقمر رأيتهم لي ساجدين: صدق الله العظيم.

الآية: سورة يوسف

قال الرسول الكريم محمد عليه السلام. انقطع الوحي و بقيت المبشرات قالوا و ما المبشرات؟ يا رسول الله. قال: الرؤيا الصالحة يراه المؤمن أو يرى له.

الحديث المقدس

الرؤيا الصالحة وحي الاولياء.

عبدالقادر الجيلاني

الرؤيا الصالحة تنبع من روح مشرقة بنور الله.

عمر السهروردي

بووە بەم جزرە کاتێ کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام سەقام گیر بوو ویستیان شتێ‌دا بێن کە کاتی نوێژ بوون خەڵک بزانێ بە هۆیێ ئەو شتەوە هەندێ وتیان کاتی بوونی نوێژەکان ئاگر دەکەینەوە هەندێکیش وتیان ناقۆس لێدەدەین بەڵام شەو لە خەودا چاردە کەس لە یارانی پێغەمبەر جوبرابلیان لە خەو دیت کە ووشەی بانگدانی پێ ووتن وە یەکێک لەو چاردە کەسە عومەری کوڕی خەتاب بوو ئەوانیش هەموویان خەوەکەیان عەرزی پێغەمبەری مەزن کرد ئەویش بڕیاری لە سەرداو بوو بە دروشمی کاتی بوونی نوێژ هەروەها پێغەمبەری بەرێز (محمد) فەرموویەتی: رویا المؤمن جزوء من ستة و اربعین جزأ من النبوة:

واتە خەونی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی وە هەزاران بەڵگەی پتەو هەیە کە ئاینی ئیسلام ئەو پەڕی گرنگی داوە بە خەون نەک لە بەر ئەوەکە خەون پەیوەندی بەس بە ئاینی هەبێ بەڵکو لە بەر ئەوە کە خەون ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە پەیوەندی بە هەموو ئادمیزادەوە هەیە وە زانایانی بە ناوبانگی ئیسلام زور دربارەی دراون وخەونان بە حەقیقەتی ڕاستی دەرخستووە وە بە بەڵگەی بەهێز ئەمەیان پوچ کردۆتەوە کە هەندێ کەس دەڵێن خەون ئەو ڕووداوانەی کە لە ژیانی ڕووژانەی مرۆڤدا ڕوودەدات دەیندرێتەوە وە ناوی ئەبرێ بە خەون. مامۆستا محمودی زەمەخشەری و مامۆستا فارابی و مامۆستا ئەبوعەلی سینا شێخی غەزالی و شەیخ عبدالقادر گەیلانی و ئەبو نەجیبێ سەهرەوەردی و شەیخ عبدالواحدی یەمانی و مامۆستا خالیدی کوردی و مەلاحەیدەری ماوەرانی و عالمی بەناو بانگ دەربارەی خەون دواوون و سەلماندوویانە کە خەون هەبوونێکی ڕاستەقینەو دوورە لە هورپنەو دووبارە بوونەوەی ڕووداوی ژیانی ڕۆژانە:

خەون لە لایان زانایانی (تصوف) بە بەیامێکی بەرزی یەزدانی بۆ ئادمیزاد داندراوە وَە دەفەرموون کە خەو پەیوەندی بە گیانەوە هەیەو بەس:

چوونکە کاتێ کە خوا هەموو گیانی ئادمیزادی درووست کرد هەموو گیانێک بە پاکی درووست کراوە هەموو گیانێک ئاگاداری هەموو ڕووداوی بوونەوەر کرا تاکوو تێک چوونی ئەستێرەی زەوی:

جا ئەگەر ئەو گیانە هاتە بەر بەدەنێکی واکە بەهۆی تاوانبارییەوە گەردی نەگرت و بەڕووناکی مایەوە ئەوە ئەو گیانە لە بێداری و بێخەویدا شت ئەبینیو ئەزانی کە ئەم شت زانینەش یادی ڕۆژی خۆیەتی کە درووست کراوە وە بەم زانینە ئەوترێ (کرامەت) کە عیلم ناوی ناوە (الحاسة السادسة) هەستیاری شەشەم بەلاّم ئەگەر گیان کەوتە بەر بەدەنێکی زەنگاوی کراو بەهۆی کوفرو تاوانباری ئەوە دەبێتە پەردە لە نێوان یاد کردنەوەی گیانە کە بۆ شتی نەهاتووە ناینا‌سێتەوە بەلاّم ئادمێزاد کە نزوست لە بەر ئەوە لە کۆمەڵی تاوانباری دوور دەبێتەوە ئەو کاتە دەتوانی ئەو شتەی لە کاتی خۆی دیویە بیناسێتەوە یادی بکاتەوە کە ئەمەش خەونی پێدەوترێت بەلاّم ئەم ڕووداوەش بە گوێرەی پایەی پێغەمبەران نیە چونکە خەونی پێغەمبەران هەر بە سرووش واتە [وحی] دەژمێردرێت لە بەر ئەوە پێغەمبەران کە خەویان لێ کەوتووە دڵیان هەر ئاگادارەو نەخەوتووە:

بەلاّم تاکوو ئێستاش زانایانی دەروون ناسیو پزیشکەکانی دەروون لە مەتەڵی: خەون سەریان سوڕماوە بزیان دەرنەکەوتووە کە خەو چیە. جا لام وابە ڕۆژێک دێت زانایان بەوپەڕی گرنگی و بایەخ پێدان سەیری خەو دەکەنو پرۆگرامو کتێبی بۆ دادەنێن:

# سەرچاوەکان:

١ـ منتخب الكلام في تفسير الاحلام: تأليف العالم المعبر ابن سيرين: الكردي.
٢ـ تعطير الانام في تعبير المنام: تأليف العالم المعبر عبدالغني النابلسي.
٣ـ كتاب الاشادات في علم العبادات: تأليف العالم ابن شاهين.
٤ـ حياة الحيوان: للشيخ الدميري الكردي.
٥ـ كيمياى سعادت: تأليف الشيخ محمد الغزالي. باللغة الفارسية.
٦ـ تفسير الرؤيا: تأليف حسن بن البهلول.
٧ـ تعبير الرؤيا: لأرطاميدورس الامنى.
٨ـ پرتو جانها: تأليف العلامة نصير الطوسي باللغة الفارسية.
٩ـ اعانة الطالبين: تأليف الفقيه الجليل زينى دحلان.
١٠ـ مرشد المعبرين: تأليف العالم الزاهد ملا عبدالقادر سەری کانی خۆشنار.

# « پیتی ئەلف »

الله: خودا: خودێ: خولاّ: یەزدان:

کەسێک خوا بە بێ ڕەنگ و چۆنەتی ببینی لە خەودا ـ ئەوە لە دین و دنیا بە بەختیاری دەژی: ئەگەر خوا لە پشتی پەردەوە قسەی لەگەڵ بکات ئەوە پایەی زۆر بەرزی دەست دەکەوێ. ئەگەر لە هەرێمێک خوا بە تووڕەیی دەبینرا ئەوە خەڵکی ئەو هەرێمە لە فەرمانی خوا لایان داوە ئەگەر کەسێک لای وابوو خوا بۆلای خۆی بانگی کرد ئەوە زوو دەمری ئەگەر خوا شتێکی دایە ئەوە کە مرد دەچێتە بەهەشت ـ ئەگەر لای وابوو خوا لە سەر تەخت دانیشتووە ئەوە فەرمانی خوا بە تەواوی جێبەجێ دەکات.

ئادەم پێغەمبەر (د.خ):

بە خزمەت گەیشتنی. لە خەودا کردنی تاوان و تۆبە کردنە ئەگەر لای وابوو ئادەمی بەتووڕەیی دیت ئەوە لە وڵاتی خوی دەردەکرێت. ئەگەر لای وابوو بە ئادەم یان بە برادەری ئادەم ئەوە حەج دەکا یان ژن دەهێنی. یان ژنێک فێڵی لێ دەکات ـ یان منداڵی پەیدا دەبێ یان ژنێ حەزی لێ دەکات.

ئیدریسی پێغەمبەر (د.خ):

بە خزمەت گەیشتنی و دەست ماچکردنی. دینداریە بە دڵسۆزی

ئەگەر لای وابوو ئیدریس شتێکی دایە ئەوە کوڕێکی دەبێتە خوێندەوارو زۆر سودی بۆ کۆمەڵ دەبێ ئەگەر لای وابوو ئیدریس لێی توڕەیە ئەوە ڕیابی دەکات لە دینداری ئەگەر جلکێکی دایە ئەوەیان خۆی یان خزمێکی دەبێتە بەرگ دوورو پیشەسازی چاک.

ئیبراهیم پێغەمبەر(د.خ):

ئەگەر ژن لە خەویا بە خزمەتی گەیشت ئەوە کوڕێکی دەبێ تووشی بەلا دەبێ بەڵام ڕزگاری دەبێ. بە خزمەت گەیشتنی و دەست ماچکردنی بە دەست کەوتنی پایەی بەرزە ئەگەر توڕە بوو ئەوە تاوانبارییە بە نوێژ نەکردنو ئازار دانی باب و داک: ئەگەر کەسێک جلکی ئەو بکاتە بەری ئەوە تووش بوونی کوێرەوەرییە لە لایان زۆردارانەوە بەڵام ئەنجامی سەرکەوتنی ئەوە.

ئیسحاق پێغەمبەر(د.خ):

بە خزمەت گەیشتنی تووش بوونی غەم و خەفەتە ئەگەر کەسێک لای وابوو بەرگی ئەوی کردە بەر ئەوە کوێر دەبێ هاتنی بۆ جێگایێک هەرزانی شتومەکە لەوێ...

ئیسماعیل پێغەمبەر(د.خ):

بە خزمەت گەیشتنیو دەست ماچکردنی لە خەودا ڕەزامەندی یە بە هەموو کارەساتو ڕووداوی ژیانو سوپاس کردنی خوایەو دینداری ڕاستەقینەیەو خزمەت کردنی مزگەوتە وە ئامۆژگاری کردنی خەڵکە بۆ چاکە کردن:

ئەیوب پێغەمبەر (د.خ):

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا تووش بوونی دەردی سامناکەو لە دەست رۆیشتنی سامانە بەڵام ئەنجام ئەو کەسە تووشی دەبێ ئەگەر کەسێکی نەخۆش دیتی ئەوە دەمرێ بەڵام دەچێتە بەهەشت.

ئەرمیا پێغەمبەر (د.خ):

بە خزمەت گەیشتنی: دینداریو دەوڵەمەندیو ژیانی باشە ئەگەر لە ناو دارستانو کشت و کاڵ دیترا ئەوە ئەو شتە دەسووتێ. ئەگەر شتێکی دایە ئەوە بە موسوڵمانی دەمرێ.

ئیسرافیل:

دیتنی لە خەودا لە هەرێمێک نیشانەی ژیانی شادی خەڵکی هەرێمە کەیە بەڵام ئەگەر کەسێک دیتیو لای وابوو خەریکی لێدانی نەفخی سوورە ئەوە پەیدا بوونی دەردوو بەڵاو شەڕو کوشتارە لە دونیادا.

الیاس پێغەمبەر (د.خ):

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا خزمەت کردنی داماوو هەژارانە.

ئینجیل:

خوێندنی لە خەودا ئەگەر ستایشی خوا بوو ئەوە گرتنی ڕێبازی ئاینی ئیسلامە بە دڵسۆزی بەڵام ئەگەر خوێندنی شتی پڕوو پوچ بوو ئەوە لادانە لە فەرمانی خوای مەزنو بە دوا کەوتنی هەواوو هەوەسی دونیایە.

ابوبکری صدیق:

به خزمەت گەیشتنی لە خەودا وە دەست ماچکردنی جێبەجێ کردنی فەرمانی خوایە بە دڵ سۆزی هەروەها خێر کردنە بە هەتیوانو بێوەژنان وە زاڵ بوون بە سەر دووژمنداو خوێندنی قورآنی پیرۆز بەزۆری:

ئاو... ئاف:

خواردنەوەو مەلە کردنی ناو ئاوی پاک و ڕووناک لاچوونی غەمو گەیشتن بە ئاوات و سوود وەرگرتنە لە برادەری باش شت ـ شوشتن بە ئاوی پاک تۆبە کردنە لە گوناحان ئەگەر کەسێک لە خەودا ئاوی بە کەسێکدا کرد ئەوە بە قەی ئەو کەسە واز لە زۆر شتی خەراپ دەهێنی گۆڕانی ڕەنگی ئاو نەخۆشی بە شوشتنو مەلە کردنو خواردنەوەی ئاوی پیسو لیلْ تووش بوونی کوێرەوەری یە بەلأم لە ئەنجامدا دەگاتە شادی

ئاودەست: خەلا:

چوونە خەلا بۆ پێشاو کردن خەبات کردنە بۆ دەوڵەمەندی نوێژ کردن لە ئاویا تیربازی کردنە سواقدانی سوار بوونی ژنی خۆیەتی لە پشتەوە قسە کردن لە ئاویا بوختان کردنە بە ژنێکی بێ ئاوان: نووستن لە ئاویا درۆ کردنە.

ئارەق: عەرەق: مەی: ئاڵ کۆڵ:

خواردنەوەو کڕینو فرۆشتنو درووست کردنی مەی لە خەوا بە دەست هێنانی ماڵی حەرامە ڕژاندنی ئارەق بە سەرزەویندا سەرف کردنی ماڵە بە بێ سوود. دەست شووشتن بە ئارەق خواردنی ماڵی کەسێکی زۆردارە:

ئاسن:

بـــە دەست کـەوتنی لە خـەودا هـێزو دەسـتەڵاتە: تـوانـدنەوەی دەوڵەمەندی‌یە بە هۆی پیشەسازی خـواردنـی بـە نـان غـەیبەت کـردنی یارانی دەستەڵاتدارە کە بەم هۆیەوە تووشی دەردەسەری دەبێ خانووی ئاسن پاشا بێکی دڵ رەق و زۆردارە بەڵام تەمەنی کورتە. نەرم بوونی لە بەر دەستدا زاڵ بوونە بەسەر کۆسپی ژیاندا..

ئاگر: ئاور: ئا: تەر

ئەگەر ئاوری بە گرمەو پریشک لە هەرێمێک دیترا ئەوە لەوێ شەڕوو کوشتار زۆر دەبێ: خواردنی ئاگر. خواردنی ماڵی هەتیوانە. شـەر کـردنی دوو ئاگر بەرانبەر یەکتری. شەڕکردنی دوو لەشکەرە. کەوتنەوەی ئاگری بە دروکەڵ لە وولاتی پەیدا بوونی دەردوو بەلایە بوو خەڵکی وولات ئەگەر کەسێک لای وابوو لە جێگایی تاریک ئاگرێکی رووناک دەری کردەوە ئەوە خەڵک رادەکێشێ بۆ رێگەی خواپەرستی بـەڵام لە جـێگایێکی روونـاک لادانە لە ئایـنی ئـیـسلام خۆ گەرم کردنەوە بە ئاگر دەوڵەمەندی‌یە چوونە نار ئاگروو هاتنە دەری تۆبە کردنە لە خەراپە کردن ئەگەر ئاگر لە ماڵێک بەربوو ئەو ماڵە تووشی خۆشی دەبێ ئەگەر کـەسێک بـاغو گـوڵزاری دی لەنـار ئاگردا ئەو کەسە لە بەڵایی زۆر گەورە رزگار دەبێ.

ئاسنگەر:

کەسێک لای وابوو لە خەودا بـوویە ئـاسنگەر ئـەوە دەسـتەڵاتی زۆر دەبێ: برادەرایەتی ئاسنگەروو لای دانیشتی لە خەودا کردنی بێ فەرمانی خوایە بەزۆری مردنی لە خەودا مردنی پاشایە ئەگـەر ژنێک لای وابـوو

بروبته ئاسنگەر کاری دەکات نابرووی دەچێ.

ئالیک: ئەلف:

کەسێک لای وابور لە خەویا ئالیکی دەدا بە ئاژەڵ ئەوە کردنی ئیشی سوود بەخشە بۆ خۆیو کۆمەڵ. کە بەم هۆیە لە لای خەڵک خۆشەویست دەبێ.

ئالآ: بەیداغ:

دیتنی ئالآی سپی کە هەڵ درابێ لە هەر هەرێمێک ئاسایشی کۆمەڵە هی سوور پەیدا بوونی شەڕوو کوشتارە هی ڕەش دەستەلآتی پاشای وولآتە هەڵ گرتنی ئالآ پابەبەرز بوونە. هێنانە خواری ئالآ لە ناوچوونی پاشایە دڕانو کۆنی ئالآ کەم دەسەلآتی پاشایە ئەگەر لە سەربانی مالێک ئالآ هەڵ درا ئەوە مردنی خاوەن ماڵە.

ئاش: ئاسیاو:

کەسێک لە خەویا لای وابوو چوو بۆ ئاش و باراشی هاڕی ئەو کەسە دەگاتە ئەو مەبەستەی کە هەیەتی جا هەر چێک بێت کەسێک لای وابوو ئاشێک دەگەڕێ بەبێ دانەوێڵە.. ئەوە ئەو کەسە دەمرێ ئەگەر لای وابوو ئاشی بەرد دەهاڕێ ئەوە لەو هەرێمە شەڕوو کوشتار ڕوو دەدات ئەگەر دانەوێڵەی کردە نار ئاشو نەی دەهاڕی ئەوە سەفەر کردنێکی دوورە وولآتە. ڕاوەستانی بەرداش ئەوە مردنی خاوەن ئاشەکەیە هەبوونی ئاش لە ناوەندی شار ئەوەبە ئەو شارە تووشی بەلآ دەبێ بە هۆی زۆرداری.

ئه‌سپۆن:

شت شوروشتن به ئه‌سپۆن تۆبه كردنه له گوناحان و گرتنی ڕێبازی خواپه‌رستی یه به ئامۆژگاری كردنی مه‌لایێكی زاناو دڵ پاك.

ئاشنا: ئاسیاو: برادەر: ئاسیار:

دیتنی: ئاسیار له خه‌ودا به شادی هاتنی مژده‌ی خۆشه بۆ خه‌و بینه كه به‌ڵام دیتنی به توڕه‌یی ئه‌وه كردنی..

ئێشێكی سووكه كه ئابڕووی پێ ده‌چێ ئه‌وه دیتوویه‌تی.

ئاسمان: گه‌ردون:

كه‌سێ لای وابوو له خه‌ودا نزیک بووبته‌وه له ئاسمان ئه‌وه له خوا نزیک ده‌بێته‌وه: كه‌وتنه خوار له ئاسمان گوناح كردنه: چوونی سه‌ر ئاسمان پایه‌ی به‌رزه: سوور بونی ئاسمان په‌یدا بوونی شه‌ڕوو كوشتاره: ئاگر بارین له ئاسمان غه‌زه‌بی خوایه: ڕووخانی ئاسمان مردنی پاشای وڵاته: كه‌وتنی ئاسمان به سه‌ر زه‌ویدا ـ زۆربوونی مردنی خه‌ڵكه له هه‌رێمه كه: لوولدانی ئاسمان لاچوونی پاشایه له سه‌ر كار شه‌ق بوونی ئاسمان گوناح كردنی زۆره ـ سه‌ركه‌وتنی ئاسمان به ئاسانی مردنی خه‌ون بینه كه‌یه به زوویی.

ئه‌سپێ مۆریان:

كوشتنی ئه‌سپێ له خه‌ودا تۆبه كردنه له گوناحان: خواردنی له خه‌ودا چاكه كردنی له گه‌ڵ كه‌سانی بێ ئه‌مه‌ک: گه‌ستنی ئه‌سپی گوناح كردنه زۆر بوونی ئه‌سپێ له هه‌رێمێک غه‌زه‌بی خوایه..

ئەسپ:

سوار بوونی لە خەودا گەیشتنە بە ئاوات: بەر بوونەوە لە ئەسپ تووش بوونی دەردە سەرییە دیتنی ئەسپی سپی شایبە هی ڕەش دردە و بەڵایە ئەسپی زەرد نەخوشە ئەسپی سوور کردنی ئیشێکە کە پەشیمانی تێدایە هەروەها دیتنی ئەسپی بۆز کردنی کرداری چاکە. دیتنی ئەسپی شین گران بوونی نرخی چەکی شەڕە: خواردنی گۆشتی ئەسپ هەژاری خاوەنەکەیەتی: کڕینی ئەسپ غەزا کردنە: بەستەوەی ئەسپ غەیبەت کردنی پیاوی گەورەیە مردن و لە دەست چونی ئەسپ لە ماڵ خێرو بەرەکەتە حیلەی ئەسپ هاتنی دووژمنە بۆ سەر وولات.

ئەستیو:

بە دەست کەوتنی لە خەودا پشتگیری کردنی هەژارانە بۆ کارو باری ژیان: هەڵ گرتنی ئاگر بە ئەستیو جێبەجێ بوونی ئەو مەبەستەیە کە خەباتی بۆ دەکات: شکانی ئەستیو لە دەست چونی برادەرێکی بە وەفایە:

ئەستێ:

ئاگر هەڵ کردن بە ئەستێ گەیشتنە بە ئاوات بە ئاسانی: شکانی ئەستێ لە دەست چوونی ماڵی دونیایە:

ئەنگوستیلە:

کەسێ لای وابوو ئەنگوستیلەی جوانی کردە دست ئەوە پایەی بەرزی دەست دەکەوێ یان ژنێک باش مارە دەکات: ئەگەر ژنێک لای وابوو ئەنگوستیلەی کردە قامکی ئەوە لای مێردی بەرێز دەبێ ئەگەر کچ بوو ئەوە مێردی باشی دەست دەکەوێ: بزر بوونی ئەنگوستیلە لە دەست چوونی

پایەو ماڵی دونیایە ئەنگوستیلەی زێڕ بۆ ژن پەیدابوونی کوڕە بەڵام بوو پیاو تووش بوونی غەمو دەردن هی‌زیو بە دەست کەوتنی ماڵی دونیایە: ئەنگوستیلەی یاقوت یان ئاسن یان مس‌یان دار هەموویان مارە کردنی ژنی بێوەژنە. ئەگەر لای وابوو ئەنگوستیلەی لەقا مکێک کردە یەکتر ئەوە ژنەکەی دڵداری دەکات لەگەڵ کەسێکی ناکەس: ئەگەر لای وابووا ئەنگوستیلەیان دایێ ئەوە ناوی بە چاکی بڵاو دەبێتەوەو دەوڵەمەند دەبێ. ئەگەر لای وابوو ئەنگوستیلەی ژەنگاوی بووە ئەوە تووشی غەمو هەژاری دەبێ: لە دەست کردنی زۆر ئەنگوستیلەی گرتنی برادەری باشە: ئەگەر نەقیمی ئەنگوستیلەی جوان بوو ـ ژیانی کامەرانی‌یە لە دونیاداو لاچوونی غەمو خەفەتە..

ئەسکوێ: مەلاقە: کەشتیلە

کەسێ لای وابوو ئەسکوێ بە دەستەوەیەو چێشتی پێ تێک دەدات ئەوە ئیشی خەڵک جێبەجێ دەکات: شکانو سووتانی ئەسکوێ ساڵی بێبارانەو گران بوونی نرخی دەغلو دانە ئەسکوێ ئاسن تووش بوونی غەمو خەفەتە بۆ ئەو کەسەی دیتوویەتی: جوانی ئەسکوێ ژیانی خۆشە.

ئەستوندە: کۆڵەکە:

ئەستوندەی جوان کە لە خەودا کەسێ دیتی دەگات بە ئاوات: ئەستوندەی خوار بە دەست کەوتنی کردنی کارێکی سووکە لە ناو کۆمەڵ شکانی ئەستوندە لە بن خانوودا مردنی خاوەن خانووە درێژی ئەستوندە تەمەن درێژی خاوەنەکەیەتی. چاک کردنەوەی خانوو بە ئەستوندە ڕزگاری خاوەنی خانووەکەیە لە نەخۆشیو دەردو خەم:

ئەکسورد: ئەستۆ: گەردەن:

ئەستور بوونی بەبێ هێنان دانەوەی سپاردەی خەڵکە، بە تەواوی کورتی خەیانەت کردنە لە سپاردە. ئەگەر لای وابوو بە شمشیر ئەستۆیان بڕی ئەوە لە نەخۆشی چاک دەبێتەوە هێنانی ئەستۆ حەسودی بردنە بە خەڵک ڕووناک دانی ئەستۆ دینداری‌یە: شین بوونی مو لە سەر ئەستۆ کردنی کاری مەردانەیە: هەڵ واسینی دوڕو مەرجان بە ئەستۆ مانای وایە یان خۆی یان خزمێکی دەبێتە عالمێکی ئاینی کە کۆمەڵ سوودی لێ دەبینی زەرد بوونی ئەستۆ تووش بوونی نەخۆشی‌یە.

ئەستێرە:

دارژانی یەک ئەستێرە لە خەودا نزیکبوونی مردنی خەون بینەکەیە: ـ خواردنی ئەستێرە غەیبەت کردنی خەڵکە. کۆمەڵ بوونی زۆر ئەستێرە لە دەوری کەسێک کۆ بوونەوەی یارانی دینداره لە دەوری ئەو کەسە کەوتنی ئەستێرە لە ئاسمان بۆ زەوی مردنی کەسێکی ناودارە: گرتنی ئەستێرە: پەیدا بوونی کوڕێکی پایەبەرزە: هەڵاتنی ئەستێرەو ڕون بوونی نەگەیشتنی خەون بینە کەیە بە ئاوات. دارژانی ئەستێرە بە زۆری مردنی خەڵکە بە زۆری نیشتنەوەی ئەستێرە لە سەر سەرروشانی هەر کەس لە خەودا بەرز بوونی پلەی کەسەکەیە: بەڵام زوو لە دەستی دەچێ ـ هاتنی کۆمەڵەی ئەستێرە بۆماڵی کەسێک لە خەوا مردنی کەسەکەیە:

ئەستێرە ناسی: نجومگەر:

کەسێ لای وابوو بوو بووبە ئەستێرە ناس لە خەودا ئەوە حیلەو و حەواڵە لە خەڵک دەکات دیتنی ئەستێرە ناس گرتنی برادەرێکی بێبار و

فێڵبازە..

ئەسپاردە: ئەمانەت:

کەسێ لای وابوو لە خەویا ئەسپاردەی خەڵکی لایەوە بە تەواوی دایەوە ئەوە حەج دەکات ئەگەر لای وابوو بە ناتەواوی دایەوە ئەوە تووشی دەردەسەری دەبێ لە لایان ماڵو منداڵی خۆیەوە:

ئاشتی:

ئاشت بوونەوە لە گەڵ ناحەز لە خەودا دینداریيە: ئاشتی کردنی دوو کۆمەڵ شەڕکەر بەجێ هێنانی فەرمانی خوایە لەو هەرێمەی ئاشتی لێ کراوە: لاری بوون لە ئاشتی بە دواکەوتنی ڕێبازی شەیتانە: بۆ ئەوەی لاری دەکات..

ئەشکەوت: غار:

چوونی ئەشکەوت لە خەودا پەنا بردنە بۆ کەسێکی بەهێز بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکەی ڕووحانی ئەشکەوت مردنی کەسێکی بەهێزوو بە سوودە بۆ خەڵکی هەرێمەکە گرتنی زارکی ئەشکەوت پێ شێلْ کردنی مافی هەژارانە لە لایان کاربەدەستانی میری.

ئاش‌پەز:

کەسێک لە خەودا لای وابوو بوو بووبە ئاش‌پەز ئەوە لە لایان پاشای وولات دەبێتە دەستەڵات‌دار بەڵام لە دوایی لەناو دەچێ.

ئاشقاو:

کەسێ لای وابوو ئاشقاوی لە عەورەت هاتە دەرێ ئەوە واز لە ژنەکەی دەهێنی ئەگەر ژنی هەبێ دەنا واز لە کردنی زەوی و زاری خۆی ئەهێنێ و نایکاتە شینایی:

ئارد. هارد:

بە دەست کەوتنی ئاردی گەنم لە خەودا یان خەون بینەکەیان خزمێکی دەبێتە خوێندەوار بە دەست کەوتنی ئاردی زوڕات و هەرزەنو نۆک و جۆ بە دوا کەوتنی دیداری ڕاستەقینەیە: کەسێ لای وابوو ئاش ئامیزاددە دەهاڕێ ئەوە بەڵایێکی دژوار بە سەر خەڵکی هەرێمەکە دادێت:

ئارموش: ئاوریشم: هەوریشم

کەسێک لە خەودا ئارموشی خاوی دیت ئەوە دڵداری لە گەڵ کچی دەکات..

دیتنی ئارموشی بادراو داوا کردنی ژنێکە کەبۆی نابێ لە بەر کردنی بەرگی ئارموشی بۆ پیاو بە دەست کەوتنیماڵی حەرامە پۆشینی ئارموش بۆ کچ مێرد کردنە بۆ پیاو منداڵ پەیدا بوونە ئەگەر مردوو بەرگی ئامۆشیان کردە بەر ئەوە دەچێتە بەهەشت ئارموشی سپی بۆ ژن ڕێزە بۆ پیاو خەم و خەفەتە.

ئازایی:

ئازایی لە خەودا گەیشتنە بە ئارات بە ئاسانی:

ئازار. ئێش. ژان:

کەسێ لای وابوو لە خەودا لەشی هەمووی ئازاری هەیە ئەو کەسە گوناحبارە بەرانبەر بە فەرمانی خوا: بەڵام ئازاری سەر ماناى وایە ئەوکەسە ئازاری باوکی دەدات.

ئادمیزاد: مەردوم: مرۆ:

دیتنی ئادمیزادی نەناسراوە خەون بینەکە خۆیەتی جاچۆنی دیت خۆی وایە بەڵام ئەگەر لای وابوو ئادمیزادێکی ناسروا شتێکی دایە ئەوە ماڵی دونیای دەست دەکەوێ بەڵام ئەگەر لای وابوو شتێکی لێ ستاند ئەوە لە دەست چوونی ماڵی دونیایە: وە پەیدا بوونی ناکۆکی‌یە لە نێوانیاندا.

ئاوڵە: خروکە:

تووش بوونی نەخۆشی لە خەودا قەرد «قەرز» نەدانەوەی خەڵکە: چاکبوونەوە لە نەخۆشی ئاوڵە قەرد دانەوەیە: ئەگەر لای وابوو منداڵی تووشی نەخۆشی ئاوڵە بووە ئەوە دایکی ئامۆژگاری خەراپە لەو منداڵە دەکات: کەوتنەوەی نەخۆشی خروکە لەو وڵاتی لە خەودا زۆر بوونی ماڵی حەرامە لەو وڵاتە.

ئاوبارە:

درووست کردنی لە خەودا بۆ ئاودانی شینایی باس کردنی ئەوکەسەیە بە چاکە لە لایان کۆمەڵەوە: درووست کردنی ئاوبارە بۆ ئاوی خواردنەوە: ئەوە کوڕێکی دەبێ دەبێتە ئەندازیار.

**ئاوارە بوون دەربەدەری:**

کەسێ لای وابوو دەربەدەر بوو لە وولاتی خۆی ئەگەر لای خۆش بوو ئەوە تووشی غەم دەبێ ئەگەر لای ناخۆش بوو تووشی شادی دەبێ.

**ئاووردانەوە: لاکردنەوە**

لە خەودا ئاووڕدانەوە بۆ لای ڕاست تۆبە کردنە لە گوناهان بۆ لای چەپ بە دواکەوتنی خراپەیە: بۆلای پشتەوە تووش بوونی غەمە ئاووڕدانەوە لە نوێژدا بێ موبالاتی کردنە لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا..

**ئاوەدانی:**

کەسێ لای وابوو لە چۆلی چوو بۆ ئاوەدانی ئەوە ڕوو دەکاتە دینداری ئەگەر لە ئاوەدانی ڕووی کردە چۆلی ئەوە ڕوو دەکاتە کەم دینی ئاوەدان کردنەوەی چۆلی ئامۆژگاری کردنی خەڵکە بۆ خواپەرسی.

**ئاودان:**

ئاودانی شینایی لە خەودا بە دەست کەوتنی پایەی بەرزە: ئاودانی زەوی بەردەلانو بێ شینایی مارە کردنی ژنو تەلاقدانی ژنەکەیە.

**ئەڵماس:**

بە دەست کەوتنی لە خەودا جێبەجێ بوونی مەبەستە کەیەتی بە هۆی کەسێکی دڵپاک دۆزینەوەی کارگەی ئەڵماس: بە دەست کەوتنی پلەی بەرزە. خواردنی ئەڵماس تووش بوونی غەمو خەفەتە: شووشە بڕین بە ئەڵماس مارە کردنی کچێکی نازاندی یەکە ڕابواردنی لەگەڵ دژوارە.

**ئەندازیار: موهەندیس**

کەسێک لای وابوو بووە بە ئەندازیار ئەوە خزمەتی کۆمەڵ دەکات

**ئامان: قاپ:**

بە زۆری شووشتنی قاپ لە خەودا لادانی حەسودیە لە دڵو دەروون.

**ئاخ:**

کەسێکی لای وابوو لە خەودا ئاخی هەڵ دەکێشا ئەوە چاکەی لە گەڵ ناکەس کردووە کە پەشیمانە:

**ئاغایی:**

کەسێ لای وابوو بوو بە ئاغا لە خەودا ئەگەر جووتیار بوو ئەوەدری «شەرم» لە جووتیاران دەکات: ئەگەر مەلا بوو قسەی باش و کرداری ناڕەوا دەکات: ئەگەر بازرگان بوو ڕیبا دەخووات:

**ئاخوڕ:**

درووست کردنی لە ناو ماڵ یان لە تەویلە هێزوو دەسەڵاتە ئەگەر لای وابوو دوو ئاژەڵ لە سەر ئاخوڕی ئەو دەلەوەڕێن ئەوە ژنەکەی حەز لە دوو کەس دەکا.

**ئاوێنە هەی‌نۆک: ئەنیزک: فودیک: جام**

دیتنی هەی‌نۆکی ڕووناک ژیانی شادی‌یە بەڵام ئاوێنەی تاریک ترووش بوونی دەردەسەری‌یە: خودیتن لە ناو ئاوێنەدا مارە کردنی ژنە: ئەگەر لای وابوو تەماشای پشتی ئاوێنە دەکات ئەوە دەچێتە لای ژنی خزی لە پشتەوە:

بە دەست کەوتنی ئاوێنەی بەژەنگ لادانە لە فەرمانی خوا شکانی ئاوێنە مردنی خاوەنەکەیەتی. بە دەست کەوتنی ئاوێنەی زێڕ دینداریە. تەماشا کردنی نەخۆش بۆ ئاوێنە مردنی نەخۆشەکەیە. حەپس کراو ئەگەر تەماشای ئاوێنەی کرد ڕزگاری دەبێ. ئەگەر ژنێ بنوارێتە ئاوێنە ئەوە هەوێی بە سەر دێت. ئەستووری ئاوێنە بە دەست کەوتنی زیانی خۆشە:

ئاشەوان:

زۆر بوونی ئاش و ئاشەوان داد پەروەری و ئاسایشە لە وڵات مردنی ئاشەوان مردنی پاشایێکی دادپەروەرەو: هاڕینی شتی وا کە ناخوری نرخ گران بوونی دەغل و دانە. درووست کردنی ئاش دینداری ڕاستە.

ئاسودەیی:

کەسێ لە خەویا لای وابوو دڵی ئاسوودەیە ئەوە بەرانبەر بە خزمو کەسی چاکە دەکات.

ئاسایش:

پەیدا بوونی ئاسایش لە وڵاتێ بەجێ هاوردنی فەرمانی خوایە

ئەستێری: دیرک: خار:

کەسێک لە خەودا لای وابوو ئەستێری بە بەدەنا چوو ئەوە لە لایان کەسێکی ناڕەسەن تووشی غەم دەبێ. ڕۆیشتن بە ناو دڕکدا دۆستایەتی هەندێ کەسێ ناڕەسەنە کە زیانیان لە دەست دەبینی. دروونەوەی ئەستێری تووش بوونی کوێرەوەرییە بە هۆی کردەوەی ناشیرین..

# « پیتی بێ »

بسم الله:

نووسینی بە خەتی جوان لە خەودا دیتنی گرتنی ڕێی دینداری‌یە بە ڕاستی ووتنی ئەم ڕستە پیرۆزە لە نوێژدا ئەگەر ئەوەی ووتوویەتی لە سەر ڕێبازی ئیمامی شافیعی بوو کە بە سونەتی دەزانن وە هەندێ بە واجیبی دەزانن ئەوە بە دەست کەوتنی پایەی مەزنە بەڵام ئەگەر لە سەر ڕێبازی ئەوانە بوو کە بە سونەتی نازانن ئەوە لادانە لە فەرمانی شەریعەت نووسینی و هەڵگرتنی پشت بەستنە بە خوار زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا.

بیت‌المقدس:

نوێژ کردن لە ناویدا: دەست کەوتنی میرانە لە خزمێکی: کەسێ لە خەودا لای وابوو لە ناویدا نوێژی دەکرد بەڵام ڕووی نەکرد بوو قیبلە ئەوە حەجی بە نەسیب دەبێ دەست نوێژ هەڵ گرتن لە ناویدا تووش بوونی سەفەرە: داگیرساندنی چرا لە ناویدا نەخۆش کەوتنی کوڕی خەون بینەکەیە ئەگەر کوڕی نەبێ لە ماڵی دونیا دەست کورت دەبێ:

بوراق:

کەسی لە خەودا سواری بوراقی پێغەمبەر بوو ئەوە پایەی بەرز دەبی لە دونیا هەروەها دیتنی بوراق لە خەودا مردنی بە شەهیدی‌یەو دەست

کەوتنی بەهەشتە.

باب: باوک:

دیتنی لە خەودا بە شادی: بەختیاری‌و دینداری‌یە بەڵام بە تووڕەیی لادانە لە فەرمانی خوای مەزن:

بەفر: وەور:

بارینی لە خەودا کاتی زستان خێرو بەرەکەتە. بەڵام لە کاتی خۆی نەبێ بارینی دەردو غەمە بۆ خەڵکی هەرێمەکە: بارینی بەفر لە شارێک بە زۆری هەراسان بوونی خەڵک بەم هۆیەوە ئەوە هاتنی عەسکەری پاشایێکی زۆردارە بۆ هەرێمەکەو ئازاردانی خەڵکەکەیە. خواردنی لە خەودا قسە کردنی بێ سوودە. نووستن لە سەر بەفر تووش بوونی غەمە: شەڕە بەفر قسەی نالەبار بە یەکتر وتنە. ماڵینی بەفر گرتنی ڕێبازی دینداری‌یە بە ڕاستی..

بــا:

کەسێ لای وابوو بای گەرم دێت لە وولاتێ ئەوە دەردو بەڵا دێتە سەر ئەم وولاتە بای فێنک شادی‌یە. بای سارد بێ ئەمری کردنی خەڵکە بۆ فەرمانی خوای مەزن هاتنی با بە گرمە گرم بۆ هەرێمی ئەوە پەیدا بوونی شەڕو کوشتارە لەوێ ـ هاتنی ڕەشەبارو زریان بە توندی بەجۆرێ خانوو بەرەی دەڕووخاند ئەوە غەزەبی خوایە لەو هەرێمە بەهۆی تاوانی زۆر: هاتنی بای شەماڵ لە هەر وولاتێک شادیە بۆ خەڵکەکە:

باران:

بارینی بارانی هێمن له خەودا له کاتی خۆی ژیانی کامەرانی بە بۆ خەڵکی هەرێمە کە بارانی لافاو هێنەروو زیان بەخشی هاتنی دەردوو بەلایە بۆ ووڵات. بارینی خوێن لە هەر ووڵاتی. ڕوودانی شەڕوو کوشتارە لەوێ.

بولەرزە:

هاتنی بولەرزە لە هەرێمێک لادانی خەڵکە کەیە لە فەرمانی خوا.

بازاڕ بازێڕ:

کەسێک لای وابوو چوو بۆ بازاڕێکی وێنەی دەزانی بازاری کوێیە ئەگەر قەڵە بالغ بوو ئەوە خزمەت کردنی مزگەوتە لە لایان خەڵکی بازارەکە وە بازاڕی تاریک و پیس وازهێنانە لە خزمەت کردنی مزگەوت. بازاڕی قوماشی خوری دیتنی لە خەودا شادی خەوبینە کەیە ئاگر تێبەر بوونی بازاڕ ڕەواجی شتی فرۆشتنە. نووستنی خەڵک لە بازاڕ کەسادی موعامەلە کردنە. ڕازاندنەوەی بازاڕ بەختیاری خەڵکە. ئەگەر کەسێ لای وابوو چوو بۆ بازاڕوو موعامەلەی نەکرد ئەوە لاچوونێتی لە سەر ئەو کارەی کە دەیکات.

باشوکە: واشە:

گرتنوو گوشتنی لە خەودا لە ناو چوونی پاشایێکی زۆردارە: خواردنی گوشتی لە خەودا غەیبەت کردنی کەسێکی باشە: هێلکەی باشوکە ئەگەر ژن بە دەستی بکەوێ ئەوە منداڵی لاسارو کەم دینی دەبێت:

باربەر:

بە دەست کەوتنی لە خەودا گەیشتنە بە ئاوات. لە ناو چوونی ترووش بوونی غەمە.

بەرد: گاشە: خرِک: کالێن:

هەڵ گرتنی بەرد لە خەودا برادەرایەتی کەسێکی دڵ ڕەقە: خواردنی ووتنی قسەی بێسوودە. خانوو کردن بە بەرد. گرد بوونەوەی لە گەڵ خەڵکی دڵ ڕەق بەرد بارین لە ئاسمان. دڵ ڕەقی و بێبەزەیی‌یە لە گەڵ یەکتری. خواردنی بەردوو بوون بە بەرد لادانە لە فەرمانی خوا سوار بوونی بەرد هەبوونی ژنێکی دڵ ڕەقە وورد کردنی بەرد ئامۆژگاری مرۆڤی دڵ ڕەقە:

بادام: چەقەلە باوی:

خواردنی بادامی سەوز لە کاتی خۆی بەدەست کەوتنی ڕزقێکی حەلاڵە بەلاّم بادامی ووشک دیتنی لە خەودا ساڵێکی بێ‌دەرامەتە بڕینی داری بادام یارمەتی هەژارە چاندنی بادام حەسوودی بردنە بە خەڵک:

بنەوشە: وەنەوشە:

دەسکی بنەوشە بەدەست کەوتنی لە خەودا پەیدا بوونی کورێکی تەمەن کورتە یان ئێشێکی کەم وەختە بۆن کردنو خواردنی بنەوشە مارە کردنی کچێکی ئارامو هۆشیارە لە باخەڵ نانی بنەوشە دڵداری‌یە لە گەڵ ژنی خۆی.

باڵیف سەرین:

کردن‌وکرینی لە خەودا دەست کەوتنی ژیانی بەختیاری‌یە. درێژ بوونی باڵیف بیر کردنەوەیە لە ژیان. گەورەیی باڵیف تەمەن درێژی‌یە. دەست کەوتنی باڵیف کە جوان بێ شادی‌یە:

بیبەر، ئەسیوەت: ئالەت: بیبار

خواردنی لە خەودا بە تەنیا یان لە گەڵ هەرشتی تووش بوونی غەمە کردنی ئیشێکە کە لە دوارۆژ دەبێتە هۆی دەردەسەری:

بێژینگ:

لە بێژینگ دانی لە خەودا کردنی کاری بەجێ‌یە بەڵام شکانی کردنی کاری بێ‌سوودە.

بازڵە:

تووش بوونی نەخۆشی بازڵە لە خەودا ئازار دانی دایکە پێویستە تۆبە بکات.

باوەشێن:

باوەشێن کردن لە خەودا تەنبەڵی‌یە لە کاروباردا. کرینو فرۆشتنی باوەشێن چاو لە دەست خەڵکە بۆ ئەوە خێری پێ بکەن: ئەگەر کەسێک لای وابوو کەسێک باوەشێنی لێ دەکرد ئەوە ئازانج لەو کەسە دەبێ:

بۆن:

کردنی بۆنی خۆش شادی‌یە بەڵام بۆنی ناخۆش غەمو خەفەتە.

بزمار:

دیتنی بزماری گەورە پاشای وولاتەو بزماری وورد عەسکەری پاشایە. کوتانی بزمار لە زەوی یان لە دار بۆ پیاوی بێژن ژن هێنانە بۆ ژنی بێمیرد میرد کردنە شکانی بزماری گەورە مردنی پاشای وولاتە.

برۆ:

دیتنی برۆی هەر کەسێک بەرەشور جوانی ئەوە بەختیاری خاوەنەکەیەتی بەلام ناشیرینی زیانی هەژارییە بۆ خاوەنەکەی.

بەرتاشین:

بەرتاشین لە خەودا قەرد دانەوەی خەلکو بە دوا کەوتنی فەرموودەی شەریعەت.

بنمیچی خانو: سەلاپیتە:

سواق دانی سەلاپیتەی خانوو جوان کردنی سەرکەوتنی خزمور کەسی خاوەن خانووە کەیە بە سەر دوژمندا رووخانی. مردنی خزم و کەسە: سووتانی لە زستاندا شادییە بەلام لە هاویندا دەردو بەلایە بۆ خاوەن خانوووەکە.

باغەوان:

کەسێ لای وابوو بووتە باغەوان لە خەودا ئەوە خزمەتی مزگەوت دەکات بە دەست و بە مال. هەروەها دەبێتە هۆی مارە کردنی چەند ژنێک ... شەریعەتی ئیسلام.

بەلگە:

کەسێ لە خەوبا لای وابوو دارای شتێکی کردوو بەڵگەی لە سەر داراکەی هێنابەوە ئەوە بە هۆی ئەسێکی هێزدار بە سەر کۆسپەی ژیاندا زاڵ دەبێ.

بەتاتە:

خواردن و چاندنی بەتاتە لە خەودا بە دەست کەوتنی مالی دنیایە.

باغەوانی:

بەهەشت دیتنی لە خەودا بەڕوو خۆشی مردنە بە ئیمانەوەو چوونی بەهەشتە.

بەهەشت:

چوونی لە خەودا شادی‌یە: خواردنی میوەی بەهەشت ڕزقی حەلاڵە. یاری کردن لە گەڵ حۆری لە بەهەشت مردنە بە موسوڵمانی: ئەگەر لای وابوو ویستی ـ بڕوات بۆ بەهەشت و بەرگری لێ کرا ئەوە کردنی بێ‌فەرمانی خوایە ـ کەسێ لای وابوو دەرگەی بەهەشتی لێ گیرا ئەو کەسە بەرانبەر بابو داکی گوناحبارە: کەسێ لای وابوو فریشتە بردیان بۆ بەهەشت ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان: نزیکی لە بەهەشت و نەچوونە ناوی نزیک بوو نەوەی مردنی ئەو کەسەیە کە وای دیوە: خواردنی شیلەی هەنگوین لە بەهەشت فێر بوونی زانیاری زۆروو بەسوودە. ئەگەر پیان ورت دەچینە بەهشت ئەوە تۆبە دەکات. یان میراتی زۆری دەست دەکەوێ لە خزمێکی. کردنەوەی ئاگر لە بەهەشت خواردنی ماڵی حەرامە: ئەگەر قەسریان دابی لە بەهەشت ئەوە پایەی بەرز دەبێ: کەسێ لای وابوو کلیلی

بەهەشتی لایە ئەوە بە موسولمانی دەمری: ئەگەر مەلائکەت لە دوزەخ بردیانە بەهەشت ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان: ئەگەر لای وابوو روو بە بەهەشت دەچێت ئەوە روو دەکاتە خواپەرستی.

بژانگی چاو بژوێل:

جوانی لە خەودا دینداری‌یە: ئەگەر کەسێ لای وابوو بژانگی چاوی ناشیرینە ئەوە کەم دینی دەکات.

بلور: شووشە:

بەدەست کەوتنی شووشەی بێگەرد لە خەودا مارە کردنی ژنێکی باشە شکانی شووشەیان ژن نەلاقدانی خاوەن شووشەکەیە یان مردنی کچێتی دروست کردنی خانووی شووشە لە خەودا هێنانی کچی عالمێکی بەرزە.

بەیتار: پزیشکی ئاژەڵ:

کەسی لای وابوو لە خەوبا بوو بە پزیشکی ئاژەڵ ئەوە ئیشی خەڵک دەکات بەبێ تەملێ. مردنی بەیتار مردنی کەسێکە کە سوودی هەیە بۆ کۆمەڵ.

بەران: شەک: خرت:

کەسێ لای وابوو لە خەودا بەرانیان داپێ ئەوە دەستەلاتی زۆر دەبێ سوار بوونی بەران رام کردنی کەسێکی زۆردارە: هەڵ گرتنی بەران ئیش کردنی کەسێکی ناودارە درێژ بوونی قۆچی بەران رابواردنی ژیانی خۆشی خاوەن بەرانە کەیە لە گەڵ ژنی خۆی. کورت بوونی قۆچی بەران بێدەستەلاتی

پاشای وڵاته. کوشتنەوەی بەران بوو خواردنی سەرکەوتنە لە کاروباری ژیاندا: شەڕە بەران شەڕی دووپاشایە گوراندنی بەران خواردنی ماڵی دووژمنە مردنی بەران مردنی خاوەنە کەیەتی: دەست کەوتنی سەری بەران ـ پایەی بەرزە. ئەگەر لای وابوو چەند بەرانێکیان دایی ئەوە هەر بەرانێک بە ساڵێک دادەندرێت بۆ کاتی ئیش کردنی لەو شتەی کە لە دەستی دایە: کەسی لای وابوو بەران سواری بوو بە سەر دووژمنی دا زاڵ دەبێ.

بازن:

لە دەست کردنی بازن لە خەودا بۆ ژنی بێ مێرد مێرد کردنە بۆ پیاوی بێ ژن ژن هێنانە بازنی زێڕ لە دەست کردنی غەمێکەو دەڕوات. بازنی زیو بە دەست کەوتنی ماڵی دونیایە بازنی ئاسن و دار بۆ پیاو لە دەست کردنی مارە کردنی ژنێکی لاسارە بەڵام بۆ ژن مێرد کردنی نابەدڵە وون بوونی بازن مردنی منداڵە یان تەڵاقدانی ژنی خاوەنەکەیتی:

بەراز:

دیتنی لە خەودا دووژمنە. شەر کردنی لە گەڵ بەراز شەر کردنە لە گەڵ کەسێکی نارەسەن سوار بوونی زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا شوانی مێگەلی بەراز سەرزکایەتی کۆمەڵی بێ سوودو نارەسەنن. خواردنی گۆشتی بەراز ماڵی حەرامە: موو رستنی بەراز بە دەست کەوتنی تووش بوونی ماڵی حەرامە:

برینداری:

کەسێ لای وابوو لە خەودا برینداریان کرد ئەوە کەسێکی نارەسەن

جنێوی دەداتێ.

**بزن مژاک: سوورسەمار:**

گۆشت خواردنی لە خەودا قوت دانەوەی ڕقە بەرانبەر بەو کەسەی تاوانبارە گرتنی سوورسەمار برادەرایەتی کەسێکی بێ سوودە.

**بەژن و باڵا:**

جوانی و قەشەنگی لە خەودا بە دەست کەوتنی پایەی بەرزە. درێژ بوونی باڵا بەزۆری مردنی خاوەنەکەیەتی کورتی تووش بوونی هەژاری و بێ ماڵی‌یە.

**بارود:**

بە کار هێنانی: ئامۆژگاری کردنی خەڵکە بۆ پیشەسازی بەسوود بۆ وڵات.

**بەرخ: کاوور:**

بەدەست کەوتنی و گۆشت خواردنی بەدەست کەوتنی ماڵی حەڵاڵە مردنی کاوور لە دەست چوونی ماڵی دونیایە.

**بزن:**

بەدەست کەوتنی و گۆشت خواردنی مارە کردنی ژنێکی باشە. دۆشینی کردنی کاسبی حەڵاڵە برژاندنی گۆشتی بوختان کردنە بە ژنێکی پاک: بەدەست کەوتنی مەڕەزی بزن ماڵی حەڵاڵە.

بۆق: تورپاقە:

خواردنی گۆشتی بۆق خێرو بەرەکەتە: بارینی بۆق لە ئاسمان غەزەبی خوایە. گرتنی برادەرایەتی کەسێکی خواپەرستە. هێنانە دەری بۆق لە ئاوو فڕە دانیان بۆر وشکانی بەرگری کردنی خواپەرستانە لە دینداری: قرە قرِی بۆق هاتنی بەلایە:

باقلە:

خواردنی و چاندنی بەزۆری دوودڵی‌یە لە هێنانی ژنێک یان لە کردنی کارێک و بەلام نەیکات باشترە: هەندێ دەڵێن خواردنی باقلەی شیز خواردنی مالی حەرامە.

بروسکە: بلاچە: چەخماغە: تریشقە:

هاتنی بروسکەی هەور ئەگەر گرمەی هەوری لە گەلا بوو ئەوە ڕوودانی شتێکە.

لە هەرێمەکە خەڵکەکە دەکەونە مەترسی فەوتانی سەروو ماڵی بەلام ئەگەر بلاچە دروتیای ڕووناک کردوو هەوری نەبوو ئەوە شادی‌یە بۆ خەڵکی هەرێمەکە دەبێ بروسکەو و بارانی بەهێز شەڕکردنی دوو پاشایە بەلام هی نەرمو لە سەر خۆ خێرو خۆشی‌یە:

بەن: داو:

بەدەست کەوتنی بەنی توند لە خەوداگەیشتنە بە ئاوات بەهۆێ کەسێ بەهێز:

بالوکە:

پەیدا بوونی لە سەر بەدەنی مرزڤ لە خەودا ئازاری تەبور ئەوە دانەوەی قەرزو سپاردەیە بەڕاستی بەڵام ئەگەر هێشی هەبور ئەوە خەیانەت کردنە لە سپاردەی خەڵک.

بزر بوون وون بوون:

وون بوون لە خەودا بیر کردنەوەیە لە کارێک کە ناکرێ و زەحمەتە.

بەهار:

دیتنی بەهار بە جوانی مارە کردنی ژنێکی باشە: بەهار دیتنی لە کاتی خۆی نەبێ پیدا بوونی غەمو دەردە بۆ خەڵکی هەرێمەکە: چوونە سەیران لە بەهاردا بەدەست کەوتنی ژیانی شادییە.

بلاڵوک:

خواردنی بلاڵوک لە خەودا بۆ نەخۆشی چاکبوونەوەیە. بۆ لەش ساغ حەج کردنە داردەستی بلاڵوک بەدەستەوگرتنی بەجێ هێنانی فەرمانی خوایە بڕینی داری بلاڵوک تەرک کردنی نوێژی جەماعەتە.

بۆیاغ: رەنگ

بۆیاغ کردنی هەر شتێک لە خەودا فێڵ کردنە لە خەڵک بەڵام بۆیاغ کردنی پێڵاو کردنی ئیشی حەڵاڵە. دیتنی بۆیاغ چی لە خەودا دیتنی کەسێکی حیلەبازە:

بــووک:

هــێنانی بـووک بـۆ کـەسێک بـەبێ دەهۆڵ و زوڕنـاو گـۆرانـی خـێرو خۆشی‌یە. بـەڵام بـە زەمـاوەند هـێنانی بـووک تـووشی بـوونی خـەڵکی هەرێمەکەیە بە غەم و خەفەت بە تایبەتی ئەوەی بۆدێت: بانگ کـردنی کەسێک بۆ سەر بووک ئەگەر نان خواردنی تێدا نەبوو جێ‌بەجێ کـردنی کاروباری خەڵکە بۆ خوا بە کورتی گواستنەوەی بووک بە هێمنی شادی‌یە بۆ ئەوەی بۆی دێت‌و بۆ خەڵکی گوندەکەش بەڵام بە شایی کردن‌و گۆرانی ووتن هاتنی بەڵایە:

بیر:

هەڵ فەندنی لە خەودا خواستنی ژنێکە کە زەحمەتە بۆی بێ. ئاودانی شێتانی بە ئاوی بیر پەیدا بوونی منداڵە. کەوتنە نـاو بـیر مـردنی کـابرایـە: ووشک بوونی بیر تەڵاقدانی ژنێ خاوەن بیرەکەیە: ئاو خواردنەوە لە بیر دەست کەوتنی ماڵە لای ژنەکەیەوە. کەوتنە ئاو بیر تووش بوونی حەپسـە. خســتنە دوولکەی ئاو بۆ ناو بیر ئەگەر ئاوی نەهێنا دەر بوونی منداڵێکی ناتەواوە. ڕوونی ئاوی بیر ژیانی خۆشی خاوەن بیرەکەیە..

بـاغ:

چوونە ناو باغی جوان لە خەودا دیـنداری‌یە: تەماشا کردنی باغ قورئان خوێندنە خواردنی میوەجاتی باغ پتەوی بڕوایە بە خوای گەورە هاتنە دەر لە باغ لادانە لە فەرمانی شـەریعەت: بڕینی داری باغ گوناە کـردنە: دیـتنی باغی خورما خێرو خۆشی‌یە بۆ ئەو کـەسـەی دیـویەتی بـۆ خـەڵکی ئـەو هەرێمەش کە باغەکەی لێ دیتراوە.

برنج:

چاندنی برنج لە خەوداکردنی کاری باشە. خواردنی ئارام گرتنە لە سەر زیانی ناخۆش خواردنی بەشیر دینداری‌یە کوتانی برنج زەکات دانی ماڵە.

باووشک:

کەسێ لای وابوو لە خەودا باووشکی هاتێ ئەوە ئەو کارەی کە دەیەوێت بیکات سوودی نیە.

بالوکە سیچکە سلاوە: .

دەرکەوتنی بالوکە لە چاوی ڕاست خۆشی‌یە. بەڵام لە چاوی چەپ تۆش بوونی غەمێکی گەورەیە بەهۆی لاساری ژنەکەی خۆی.

بەڵەکی:

کەسێ لای وابوو لە خەونا تووشی دەردی بەلەکی بووە ئەوەیان خۆیان خزمێکی پایەی زۆر بەرز دەبێ.

برسی‌یەتی:

کەسێ لای وابوو لە خەوداکەمێک برسی بوو ئەوە ماڵی لە دەست دەچێ بەڵام ئەگەر لای وابوو زۆر برسی بوو ئەوە ماڵێکی زۆری دەست دەکەوێ. برسیەتی لە زستاندا زۆر باشە: هەروەها برسی‌یەتی برادەرایەتی کەسێکی بێ‌سوودە:

بژار کردن:

بژارکردنی شینایی لە خەودا بەجێ هێنانی فەرمانی خوایە بەڕاستی.

بانگدانی نوێژ:

بانک له مزگەوت فەرمان کردنه به چاکه:

له جێی بەرز حەج کردنه. له مەزدادا. مردنی بانگ دەره. هەروەها لەکن ماڵی خۆی مردنه. بانگدان لەگەڵ جیرانان تووش بوونی بەڵایه. له جێیی کەبۆ بانگ دان نەشێ لەو جێیە جاسووسی کردنه له سەر خەڵک. بانگ دانو به زیادوو ناتەواوی بێ ئەمری کردنی خوایه. بانگدانی منداڵ ئازار دانی باب و داکیتی. له سەر پشتی وولاغ مردنی بانگدەره: ئەگەر کەسێکی حەپسی یان نەخۆشی له خەودا بانگیدا ئەوه رزگار بوونو چاکبوونەوەیه بانگدان له سەر مناره دەست کەوتنی پایەی بەرزه.

بڕبڕەی پشت: قەفەزە:

بەهێزی له خەودا دەست کەوتنی پلەی بڵنده. بێ هێزی تووش بوونی هەژاری‌یه ـ رەشبوون و سوور بوونی پشت کەم دەستی ماڵی دونیایه داغ کردنی پشت به ئاگر نەدانی زەکاته کوڕ بوونی پشت تووش بوونی بەڵایه بۆ خاوەنەکەی: دیتنی پشتی دووژمن ـ ئەمین بوونه له فێڵی دووژمنه کە شکانی پشت یان مردنی برایەیان یندەستەڵاتی‌یه ـ هێشانی پشت تووش بوونی حەپسە: هەڵگرتنی دار به پشت دوو زمانی‌یه له نێوان خەڵک باری گران به پشت له خەودا قەرداری‌یه بەزۆری:

باپیر:

دیتنی له خەودا به شادی گەیشتنی خەون بینه به ئاواتی خۆی ئەگەر لای وابوو باپیری شتی دایه ئەوه پایەی بەرز دەبێ دیتنی به تووڕەیی گوناهباری خەون بینەکەیه.

بایىجان:

خواردنی بایىجان لە خەودا قیڵ کردنە لە خەڵک بە ناوی دین بەڵام بۆ راوچی دەست کەوتنی نێچیری باشە.

بست: هەپل:

پێوانی شتێ بەبست لە خەودا بیر کردنەوەیە لە ئیشێکی زەحمەت بەڵام بە هۆی پارە دەکرێ کورتی بست راوەستانی کاری خەون ێنەکەیە بەڵام درێژی جێبەجێ بوونی کاروو باریتی.

بێ: بەهی:

بۆن کردنی لە خەودا ژنێکی ئارامو هۆشیارە. خواردنی بێ لە خەودا بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە بۆ مەلا زیاد بوونی زانیارییە بۆ بازرگان قازانجی زۆرە ـ گوشینی بێ بەدەست کەوتنی ماڵی دنیایە.

بــاڵ:

کەسێ لای وابوو دووباڵی هەیە ئەوە دوورکوڕی دەبێ کەسێ لای وابوو باڵی هەیەو بەڵام باڵەکانی شکان یان سووتان ئەوە منداڵی دەمرن. فڕین بە باڵ کار کردنە لە ئیشوو کاری میری. دیتنی باڵی تەیر لە خەودا دڵداری کردنە لە گەڵ کچ گرانی باڵ لە سەر بەدەن گوناح کردنە. کەسێ لای وابوو دوو باڵی زۆر جوانی هەیە ئەوە پایەی دونیایی بەرز دەبێ.

بولبول:

خوێندن وەکوو بولبول دڵداری کردنە لە گەڵ کچێ کەبوی نابێ.

بەدەست کەوتنی هێلکەی بولبول مارە کردنی کچێکی ساویلکەیە گرتنی بولبول پەیدا بوونی کورێکی قوڕان خوێنە. خواردنی بولبول بەدەست کەوتنی ماڵی دوونیایە:

بـــرا:

دیتنی براوو مام و خاڵ لە خەودا بە جوانی ڕووی گەش دەست کەوتنی ژیانی شادی‌یە.

بـەڕو:

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵێکی زۆرە بە زەحمەت دیتنی داری بەڕو برادەرایەتی کەسێکی ئارام و زانیارە. بڕینی داری بەڕو لە دەست چوونی برادەرە چاندنی بەڕو. خواردنی شیربایی‌یە. بڕینی گەڵا بەڕوو ئیش کردنی میزەیە ـ بە خەیانەت. خواردنی بە برژاوی گران بوونی نرخی دانەوێڵەیە:

بـــاز:

کەسێ لای وابوو لە خەویا باز لە سەر سەری یان لە سەر شانی نیشتەوە ئەوە لە لایان کۆمەڵ ڕێزی زۆر دەبێ. کوشتنی بازوو گۆشت خواردنی غەیبەت کردنی پاشایە. ئەگەر ژنێک لە خەودا بازی گرت ئەوە کورێکی دەبێ ئەگەر میردی هەبێ ئەگەر نامیرد بە کەسێکی ناودار دەکات فڕینی باز ـ لە دەستی هەر کەس تووش بوونی بێ دەسەلاتی‌یە. گرتنی بازی سپی ـ ئیش کردن لە کاروباری میریە

بازدان:

کەسێ لای وابوو لە خەودا بازیدا لە شوێنێ بۆ شوێنێ و بە سەلامەتی پەڕیەوە ئەوە دەگاتە ئامانجی خۆی.

بازیبەند:

کەسێک لە خەویا لای وابوو بازی بەندی لە خۆ بەست ئەوە بە سەر دووژمندا زاڵ دەبێ بە هۆی کەسێکی هێزدار.

بـــەنگ:

خواردنیو کڕینی لە خەودا لادانە لە فەرمانی خوای گەورە.

بێهێزی:

بێهێزیو لاوازی لە خەودا کردنی بێئەمری خوایە بە زۆری.

باگوردان:

دیتنی دروست کردنی لە خەودا دامەرزاندنی ئیشێکە کە زۆر سوودی هەیە. یان گێران بە باگوردان ئەگەر بانەکە تەڕ بوو ئەوە تەڵاقی ژنەکە کەوتووەو هەر لە لایەتی. بەڵام ئەگەر بانەکە ووشک بوو ئەوە میراتی خوشک و دایکی لایەو نایدا..

بنێشت:

جاوتنی لە خەودا بە دووا کەوتنی کارێکە کە بێسوودە. ئەگەر لای وابوو کەسێ بنێشتی دەجاوتو گۆرانی دەووت ئەوە بە دوای نێربازیدا دەگەڕێ کە ئابڕووی دەچێ..

باسک: قۆڵ:

ئەستوری و جوانی باسکی هەر کەس لە خەودا هێزو دەستەڵاتی خزم و کەسێتی لاوازی و ناشیرینی بێدەسەڵاتی یە: شکانو برینی باسک لە خەودا کوشتنی خزمێکی ئەوە بەهۆی فێڵی دووژمنانی خۆی: باسکی بێ قامک قسە کردنی بێدەستەڵاتی یە.

بالوعە:

کەسێ لای وابێو بالوعەی ئاوی لە ماڵەوەیە ئەوە ژنەکەی چەند هەراشە. گیرانی کونی بالوعە میز گیرانی خاوەنە کەیەتی.

برین:

کەسێ لای وابێو برینی کەوتە بەدەن ئەگەر خوێنی نەبێ ئەوە دەست کەوتنی پلەی بەرزە بەڵام بە خوێنەوە دەست کەوتنی ماڵی دوونیایە.

بێدەنگی:

لە خەودا بەدەست کەوتنی پارەی زێڕە. یان بەدەست کەوتنی میراتی خزمێکی خۆیەتی کەبەس ئەو میراتی لێ دەگرێ:

بێ هۆش بوون:

لە خەودا کردنی بێ ئەمری خوایە بۆ ڕەزامەندی زۆردارێک چاک بوونەوە تۆبە کردنە لەو گوناحانەی:

بێڵ: خاکەناز: دۆڵەمەڕ: پێمەڕە:

بەدەست کەوتنی لە خەودا هێنانی ژنێکە کە تووشی دەردەسەری دەکات شکانی لە خەودا وازهێنانە لە کشت و کاڵ.

# « پێتی پێ »

پێغەمبەران:

هەر یەک بنوارە پێتی خۆی: درورودی خوایان لە سەر بێ...

پێڵاو: کەوش:

پێڵاوی جوانو تروند لە پێ کردنی لە خەودا ژیانی خۆشی خاوەنەکەیەتی: پێڵاوی تەنگ تووش بوونی ئاژاوەی ناومالّی خۆشی یە هی سپی ژنی باشە: هی سەوز دینداری یە هی ڕەش سەفەر کردنە. بزر بوونی پێڵاو. تەڵاقدانی ژنەکەیەتی. پێڵاوی نالەبار تووش بوونی غەمو دەردەسەری یە:

پەمۆ: لۆکە: پەنبە:

بەدەست کەوتنی لە خەودا مالّی دونیایە: چاندنی بۆ جووتیار دەوامەنی زۆرە بۆ مەلا زانیاری یە. بۆ بازرگان قازانجی زۆرە. بۆ دیندار زیاد بوونی پەرستی دینە بەدەست کەوتنی بڕکی لۆکە برادەرێکی باش و بێ دەعیەیە:

پشتێن:

بەستنی پشتێنی زەرد نەخۆشی یە. هی سوورو ڕەش شادی یە. هی

سەوز دینداری‌یە: بەستنی پشتێنی قایش و ئاسن تووش بوونی حەپسە...

**پـوونگ:**

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵێکی کەمە لە لایان میراتـەوە: گوشینوو دورینی حەزکردنە لە ژنێک کە پێ ی ناشێ.

**پەنیر:**

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی رزقی ئاسانە. زۆر بوونی لە بازاڕ ساڵ خۆشی‌یە کردنی پەنیر لە لای پیاوەوە ژن بە ژن کردنە لە گەڵ کەسێکی ناڕەسەن کە پەشیمانی لە دوایە. کڕینی پەنیر تەمەن درێژی کڕیارە: ئەگەر لای وابوو عەسکەر پەنیر دەخوات بە سەر دووژمندا زاڵ دەبێ ئەگەر ژنێ لای وابوو درووستی دەکات ئەوە بەختیاری‌یە بۆ ژنەکە:

**پسان پچڕان:**

کەسێ لە خەوبا لای وابوو شتێکی لە دەست پسا ئەوە سیلەی رەحم جێ‌بەجێ ناکات بەرانبەر بە خزمو کەسی: ئەگەر لای وابوو شنە پساوەکەی گرێی دایەوە ئەوە لە گەڵ خزمو کەس خۆی ئاشت دەبێتەوە:

**پۆستە بەر:**

دیتنی پۆستە بەر لە خەودا تووش بوونی سەفەر کردنی. هەروەها گوازتنەوەی ماڵە لەو جێگەی کە لێ‌یەتی بۆ جێگەی خۆشتر...

مردنی پۆستەبەر لە خەودا جێ‌نیشن کردنی کۆچەریانە لە لایان میری‌یەوە...

پاریزەر:

کەسێک لای وابوو بووەتە پاریزەر ئەوە بیلاعەملە: مردنی پاریزەر کەم بوونەوەی دادپەروەری‌یە.

پاسەوان: ئێشکەچی:

- کەسێ لای وابوو پاسەوانی دەغلو دانو ماڵیات و بلغاتە ئەوە هەموو کاروباری ژن هێنانو تەڵاقدان دەکەوێتە لای ئەو ئەویش کاروباری خەڵک بەبێ خەیانەت جێ‌بەجێ دەکات ئەگەر کەسێ لای وابوو پاسەوان هەیە لە دەرگەی ئەو ئەوە ئەمین بوونە لە ترسی زۆرداران کە ناتوانن زیانی لێ بدەن.

پــۆر:

گرتنی پۆر لە خەودا مارە کردنی ژنێکی چەنە بازە. فڕینو مردنی پۆڕ تەلاقدانی ژنەکەیەتی. خواردنی گۆشتی پۆڕ دەست کەوتنی ماڵی دونیایە لە لایەن ژنەکەی:

پینەچی: پینەدۆز:

کەسێ لای وابوو بووتە پینەچی ئەوە ئیشو کاری خەڵک جێ‌بەجێ دەکات کە سوودی دینو دونیای هەیە:

پەلە کردن: تاڵوکە کرن: بلەزین:

پەلە کردن لە خەودا لە ئیشێک ئەگەر ئیشی دونیایی بوو ئەولادانی پەلە کەرەکەیە لە دینداری. بەڵام ئەگەر ئیشی خوایی بوو ئەوە گەیشتنە بەئاوات.

**پشت بەستی بە خوا:**

پشت بەستن بە خوا لە خەودا بەدەست کەوتنی پلەی ئەولیایانی مەزنە...

**پێ = لاق: پا:**

جوانی و پتەوی لە خەودا ژیانی خۆشە هەبوونی پێی زۆر سەفەر کردنی زۆرە شکانی پێ مردنی خاوەنە کەپەتی شەل بوونی پێ کەم دەستەڵاتی خاوەنیتی قڵیشانەوەی پێ دوودڵی‌یە لە کردنی ئیشێک: بەڵام نەکردنی باشترە...

**پێرو: ئەستێرە**

کەوتنە خواری پێروو لە ئاسمان کەم بوونی میوەجاتەو مردنی ئاژڵە بە زۆری گرتنی پێروو برادەرایەتی کەسێکی زانیارە کە سوودی هەیە.

**پاساری: کویژیلە: کێشکە: چۆلەکە:**

گرتنی لە خەودا برادەرایەتی کەسێکی بی‌سوودە: کوشتنەوەی پەیدا بوونی کورێکە تەمەنی کورتە خواردنی گۆشتی پاساری لە خەودا ماڵی دونیایە یەکەمی دەنگی پاساری مژدەی خۆشە بۆ خەون بینەکە. زۆر بوونی پاساری مردنی منداڵ و ژنە بەهۆی نەخۆشی‌یەوە:

**پەپوولە: پەلەتیک: پەروانە:**

دیتنی لە خەودا بۆ جووتیار تەنبەڵی‌یە لە کشت و کاڵ کردن بۆ کار بەدەست نەزانینی جێ‌بەجێ کردنی کاروبارە. زۆر بوونی پەپوولە لە

وولاتـێک زۆر بـوونی بێکاروو تـەنبەڵانە: بـەدەسـت کـەوتنی پـەپوولەی ئاوریشم... خێرو بەرەکەتە.

پێمەرە: بڕوانە بێل.

پیواز:

خواردنی لە خەودا بە ووشکی غەمە. بە تەڕی نەن درووستییە. کڕینی پیواز موعامەلە کردنە لە گەڵ کەسێکی حیلەباز: پاک کـردنەوەی پیواز لە خەودا ڕیایی کردنە بەرانبەر دەوڵەمەند. ئاو دانی پیواز چاکە کردنە لە گەڵ کەسێکی سپلەو و بێنمەک: چاندنی لە خەودا سوود بەدەست کەوتنە لە موعامەلە کردنی:

پـیـری:

لە خەودا بۆ گەنج پیر بوون پایەی بەرزە. بەڵام ئەگەر کەسێک پیر لای وابوو گەنج بۆتەوە ئەوە بە زوویی دەمرێ:

پــزدان:

کەسێک لە خەودا لای وابوو پزدانی دەست کەوت ئەوە برادەرێکی بە سوودە کە نهێنی دەپارێزێ.

پارە: پوڵ:

بەدەســت کەوتنی پارەی زۆر لە خەودا ژیانی شادییە: پارەی زێـڕ لە خەودا بەدەست کەوتنی زاڵ بوونە بە سەر دووژمـندا:

پێشوولە: پێشکە: تەپو: میشولە

کوشتنی لە خەودا سەرکەوتنە لە کۆسپەی زیان بە ئاسانی. زۆر بوونی لە هەر وولاتێک پەیدا بوونی دوو بەرەکی و کوشتارە لە وولاتەکە...

نیشتنەوەو پێوەدانی تەپۆ لە سەر کەسێک زیان گەیاندنی دووژمنە بەو کەسە کە لە سەری نیشتووتەوە وە گەسنوویەتی:

پەڕۆ:

کەسێک لای وابوو بەڕۆیێکی کەوتە دەست و لای خۆشبوو ئەوە کاری دەکا دڵی پێی خۆش دەبێ:

پاشێو کردن بۆ ڕۆژی:

کەسێک لای وابوو پاشێوی کرد بۆ ئەوە بە ڕۆژی بێت ئەوە بە دوا کەوتنی سوننەتی پێغەمبەرە درەوودی خوالی لێ بێ.

پێوەری ئاو:

دیتنی لە خەودا هەرزانی و ژیانی خۆشە.

پڵینگ:

کوشتنی لە خەودا زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا سوار بوونی کەوڵ لە بەر کردنی بەدەست کەوتنی پلەی بەرزە لە دونیادا خواردنی گۆشتی بەدەست کەوتنی ماڵی دوونیایە ڕام کردنی لاچوونی غەم و خەفەتە: دەنگی پڵینگ پەیدا بوونی مەترسی یە لە لایەن پاشایێکی زۆردار.

بەپوسلێمانە:

گرتنی لە خەودا لە لایان هەر کەسێک پەیدا بوونی باسی شەڕو شۆڕی پاشایانە خواردنی گۆشتی جێبەجێ کردنی کاروباری خەڵکە. فڕینی لە دەستی کەسێک بڵاو بوونەوەی دەنگ و باسی سەیرە لە ناو خەڵک:

پلک: پور = میمک:

دیتنی پلک لە خەودا بە جوانیو ڕووخۆشی شادیەو سالّی خۆشە بەڵام بە ناشیرینی بڵاو بوونەوەی خەمو دەردە:

پشکۆ: پۆلو: پەنگر:

هەڵ گرتنی بەدەست ئەگەر گەرم بوو ئەوە توورش بوونی کاری بێ سوودە بەڵام ئەگەر سارد بوو سەرکەوتنە بە سەر کۆسپی ژیاندا...

خواردنی پۆلو ماڵ خواردنی هەتیوە دیتنی لە ئاگردانیدا یان لە ناو مەقاڵەدا کۆشش کردنە بۆ دوڵەمەندی و ناگات پێی:

پشمین:

پشمین بە پێکەنینەوە مردنی کابرایە دووجار پشمین دوودڵی کردنی کارێکە کە نەکردنی باشترە. سێ جار پشمین ڕزگارییە لە دەردوو بەڵا:

پــوورش:

شین بوونی پرورش لە خەودا لە سەر بەدەنی کەسێک نزیک بوونەوەی مردنی کابرایە شین بوونی لە سەر بەری دەست خەیانەت کردنی ژنی کابرایە. کۆ کردنەوەی پرورش کۆ کردنەوەی ماڵی حەرامە:

پـاشـا:

دیتنی لە خەودا بە شادی ژیانی خۆشە. بە تورەیی کەم دینی‌یە ئەگەر کەسێ لای وابوو پاشا شتی دابێ ئەوە پلەی بەرزی دەست دەکەوێ لا لابان پاشاوە.

پشیلە: کتک: گوربە: پسیلە:

کەسێک لە خەودا لای وابوو پشیلە لە ناو ماڵە کەیەتی ئەوە دزە لە خزمی خۆی. دەیەوێت دزی لێ بکات: ئەگەر لای وابوو پشیلە گەستی ئەوە یەک ساڵ نەخۆش دەبێ. گرتنی پشیلەی مێ مارە کردنی ژنی فێڵبازە. کوشتنی پشیلە بەرگری کردنە لە دزوو جەردە پشیلەی هار: ساڵێکی ناخۆش و بێ دەرامەتە. دەنگی پشیلە ئاشکرا بوونی دزی هەریمەکەیە. خواردنی گۆشتی پشیلە فێڵ کردنە لە خەڵک لە پەنای دین. کەسێ لای وابوو لە خەوبا بوو بە کتک ئەوە لادەدا لە دینداری و ڕوو دەکاتە تەڵەکە بازی.

پاوان: میرگ یا باغ

کەسێ لای وابوو چووە ناو پاوانی خەڵک ئەوە ئەمری خوا دەکات ـ ئاودانی پاوان دینداری‌یە: برینی پاوان لە خەودا کەم دینی‌یە ـ

پارو = تیکە:

قوت دانی پارو لە خەودا بە ئاسانی جێ‌بەجێ بوونی مەبەستی کابرایە بە ئاسانی بەڵام قوت دانی بە زەحمەت تووش بوونی دژواری و ناخۆشی‌یە. ئەگەر لای وابوو پاروی لە قوڕگدامایەوە ئەو خەریکی ئیشێکە کە تێیدا تووشی ناخۆشی دەبێ ئەگەر پاروی بەهۆی ئاوەوە قوتدا ئەوە کەسێ دیندار یارمەتی دەدا بۆ جێ‌بەجێ کردنی مەبەستەکەی:

پەسیرە = قۆرە بەرسیلە:
خواردنی لە خەودا وەرگرتنی شیربایی یەکە دەبەوێ بۆ چاکە سەرفی بکات لێ کردنەوە لە دارمێو کردنی کارێکە کە رەختی نیە: گوشینی تووش بوونی ماڵی حەرامە کە لە لای پاشای وولآت وەری دەگرێ.

پێکەنین:
کەسێ لای وابوو لە خەودا پێدەکەنی بە زەردە خەندە بوو بەبێ دەنگی ئەوە خۆشیز شادی‌یە. بەڵام پێکەنینی بە قاقا تووش بوونی غەمو دەردە ئەگەر کەسێ لای وابوو منداڵی پێدەکەنی ئەوە شتی سەیر پەیدا دەبێ:

پەردە:
کەسێک لای وابوو دەرگەی ماڵێک یا پەنجەرەکەی پەردەی لە سەرە ئەوە پەیدا بوونی غەمە بۆ خاوەن ماڵەکە: پەردەی سەر دەرگەی مزگەوت کەم بوونی دینداری‌یە لە هەرێمەکە.

پەرژین:
پەرژینی باغو شینایی دیتنی لە خەودا زۆربوونی دینداری‌یە لە هەرێمەکە شکان و تێک چوونی پەرژین: پەیدا بوونی کەم دینی‌یە لە وولآت.

پەراسوو: دەندە:
کەسێ لای وابوو پەراسووی پتەوو جوانە ئەوە ژنەکەی هۆشیارو گوێ ڕایەڵیەتی. خواردنی دەندەی خۆی لە خەودا داواکردنی ماڵی دونیایە لە خزمو کەسی خۆی. شکانی پەراسوو: چەنە هەراشی ژنی خاوەن پەراسووە. نەبوونی پەراسوو لە خەودا مردنی خزمو کەسی خۆیەتی.

پــرد:

لە سەر ڕۆیشتنی و لە سەر دانیشتنو نووستنو پەڕینەوەی پرد لە خەودا بە جێ هێنانی فەرمانی خوایەو ئەمین بوونە لە حیلەی حیلە بازان.

پشتی ئادەمیزاد:

جوانیو قەڵەوی ژیانی شادییە: کەسێ لای وابوو پشتی پشتیان دارنی ئەوە بە دەردی ناکاو دەمرێ کەسێ لای وابوو پشتی ئاسنەیان دارە یان گڵە ئەوە زوو دەمرێ هێشانی پشت لە خەوداکەم دینییە.

پیسایی:

کردنی پیسایی لە خەودا بەرانبەری خەڵک کردنی کارێکە کە ئابڕووی دەچێ خواردنی پیسایی خواردنی ماڵی وەسیەتی گشتییە توندی پیسایی لە خەودا سەرف کردنی پارەیە بۆ تەن درووستی خۆی بەڵام شلی پیسایی سەرف کردنی پارەیە بۆ کەس و کاری خۆی پیسایی کردن لە ئاودەست دەوڵەمەندییە پیسایی پیاهاتن ماڵی زۆرە دەستی دەکەوێ. پیسایی کردن لە بازاڕ لادانە لە فەرمانی خوا شاردنەوەی پیسایی بە گڵ شاردنەوەی ماڵی دونیایە کەسێ لای وابوو دار لە پیسایی وەردەدات: ئەوە کار بەدەستێکی بەرتیل خۆرە پیسایی کردنە ناو دەرپێ تووڕە بوونە لە ژنی خۆی. کەوتنە ناو پیسایی تووشبوونی غەمە پیسایی کردن لە سەر تەشت. چوونە لای ژنی خۆیەتی لە پشتڕا. ئەگەر کەسێ لای وابوو کەسێک پیسایی دادا ئەوە دووژمنایەتی دەکات بەڵام چی لە دەست نایێت

پاپا:

دیتنی لە خەودا پەیدا بوونی کەسێکە ئامۆژگاری خەڵک دەکات بۆ

گرتنی ڕێبازی باش بەڵام مەبەستی خوانیە لەم ئامۆژگاریە:

**پــوڵا:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا دەستەڵاتە. تراندنەوەی زاڵ بوونە بە سەر ناحەزدا خواردنی پوڵا قوت دانەوەی ڕقە بەرانبەری کەسێ کە خەراپەی لە گەڵ کردووی.

**پشک: پێڵەقان: مەساسە:**

کەسێک لای وابوو لە خەودا پێڵەقانی کەونە دەست ئەوە برادەرایەتی کەسێک دەکات کە لە ژیاندا یارمەتی دەدا: شکانی پشک نەگەیشتنە بە ئاوات.

**پەرەسێلکە: پەرەسور:**

گرتنی لە خەودا دەست کەوتنی ماڵی حەڵاڵە. زۆر بوونی پەرەسێلکە کە لە جێگایی یان لە ماڵی خێرو خۆشی ئەو ماڵەیە خواردنی گۆشتی ڕقە بەرییە لە گەڵ کەس لە سەر سنووری خانوو:

**پاداشت: خەلات:**

وەرگرتنی خەڵات لە خەودا لە سەر چالاکی لە کاروباردا: دەست کەوتنی پلەی بەرزە بەهۆی پاشای وڵات.

**پوک: پرو:**

زیاد بوونو جوانی لە خەودا درووست کردنی مزگەوتە بە ماڵی حەڵاڵ

ئەگەر دەستەلاتی هەبێ بەلام بۆ هەژارو بێ ماڵ خزمەت کردنی مزگەوتە هێشانی پوک. نزیک بوونەوەی مردنی خاوەنیەتی.

پەرەکەر:

دیتنی لە خەودا گرتنی برادەرێکی دیندارو و دڵ سوزە: پەرە کردنی خوری و مەرزو و لۆکە لە هەر جێگایێک زیاد بوونی دینداری‌یە.

پەمپ:

بەدەست کەوتنی پەمپ هی هەرچی هەبێ سەرکەوتنە بە سەر کۆسپی نالەباری ژیانی دونیا: تێک چوونی پەمپ. هەژاری ماڵی دونیایە.

پزوو: نیفی:

جوانی‌و توندی پزوی دەرپێ لە خەودا: شەرمو حەیای خاوەنێی پسانو درانی لە خەودا کردنی کاری بێ ئابروانەیە لە ناو کۆمەڵ.

پێوەری زەوی:

دیتنی لە خەودا لە هەر هەرێمێک پەیدا بوونی کار بەدەستانی باشی میری‌یە:

پند: مێشە مریشکە:

پەیدا بوونو زۆربوونی لە خەودا ڕوودانی نەخۆشی مندالانەو مردنیان بەزۆری کوشتنی پند لە خەودا زۆر بوونی بەرهەمی ئاژەڵە.

پیاڵە: پەرداخ: ئیستیکان:

کەسێ لای وابوو پیالەی شووشەی بەدەست کەوت ئەوە گەڕانەوەیە لە خەراپە کردنو ڕوو بە چاکە ڕۆیشتنە: دەست کەوتنی پیاڵەی زێڕوو زیو دەست کەوتنی پایەی بەرزە: شکانی پیاڵە هەژاری خاوەنیتی.

پاشەوەی ئادەمیزاد:

گیرانی کونی پاشەوە لە خەودا مردنی خاوەنە کەیەتی بە زوویی... برانی پاشەوە جێبەجێ نەکردنی سیلەی ڕەحمە لە لایان خاوەنەکەی کەسێ پاشەوەی دایکی خۆی ببینی لە خەودا ئەگەر نیازی حەج کردنی هەبێ ئەوە حەج دەکات ئەگەر نا لە کاروباری خۆی دەستەوەستان دەبێ کەسێ لای وابوو پیسایی دیتەدەری لە پشتەوەی ئەوەماڵ سەرف دەکا بۆ بەرژەوەندی گشتی. ئاو خواردنەوە بە پشتەوە تووش بوونی نەخۆشیە: کەسێ لای وابوو لە گەڵ ژنێک خەریکە لە پشتەوە سواری بێ ئەوە خەریکی بەدەست هێنانی ماڵی دوونیایەو دەستی دەکەوێ:

پەنمان: ئاوسان:

کەسێ لای وابوو بەدەنی یان جێگایێکی پەنماوە ئەگەر هێشی هەبوو ئەوە دردو غەمە: ئەگەر نەیبوو ئەوە دەولەمەندیە.

پاژنە پانی:

جوانی لە خەودا پەیدا بوونی منداڵی دیندارو هۆشیارن: خوار بوونو لاوازی. هەژاریە: هێنانی مردنی منداڵە:

# « پیتی تێ »

**تەسبیحات کردن: یادکردنەوەی خوا:**

تەسبیحات کردنو تەهلیلەو تەکبیر لێدانو سوپاس کردنی خوا لە خەوداگرتنی ڕێبازی پێغەمبەرە دروودی خوای لە سەر بێ.

**تەورات:**

خوێندنی لە خەودا بە مەرجێ ماناکەی بزانێ بروای پتەوە بە خوای گەورە بەڵام کە مانای نەزانی گرتنی ڕێبازێکە دژی ئاینی ئیسلامە: خوێندنی بەدەست نوێژەوە بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەرە لە خەودا. ئەگەر ژنێک لای وابوو تەوراتی دەخوێند ئەوە کچی دەبێ ئەگەر مێردی هەبێ. خوێندنی تەورات بە ئاوازەوە گەیشتنە بە ئاوات.

**تور: ترپ:**

خواردنی لە خەودا ژن هێنانی نابەدڵە چاندنی کردنی کارێکی زەحمەتە کەتێدا تووشی دەردەسەری دەبێ.

**تۆپی پێ:**

یاری کردن لە خەودا بە تۆپی پێ بە دواکەوتنی کاری بێ ئەنجامە درانی

لە خەودا غەم و خەفەتە بۆ خاوەنەکەی. کڕینی ژن هێنانە بەڵام زۆر بە زەحمەت.

تۆپی شەڕ:

هاوبەشێتی و دەنگی لە خەودا بڵاو بوونەوەی قسەی جیا جیایە لە هەرێمەکە.

تەباشیر:

خواردنی لە خەودا تووش بوونی غەمە پێ نووسینی ئامۆژگاری کەسێکە کە سوودی نیە.

تەیارە: فڕۆکە:

کەوتنی لە هەرێمێک بڵاو بوونەوەی دەردو غەمە. بۆمبەردومانی کردنی بۆ هەرێمێک زۆرداری پاشای وڵاتە. سوار بوونی لە خەودا کردنی کارێکە کە مەترسی هەیە. سووتانی تەیارە کەم بوونەوەی جەردەیە...

تورەیی:

تورەیی لە خەودا لادانە لە ڕێی شەریعەتی ئیسلام: بەڵام تورەیی لە سەر شتی کەم دینی دینداری ڕاستەقینەی خەون بینەکەیە..

تەحیات:

خوێندنی لە خەودا: دوعا قەبوڵ بوونی لای خوای گەورەیە بەڵام بە مەرجێ لە نوێژدا بی‌خوێنێ. خوێندنی بە غەیری نوێژ هەم شادی و خۆشی‌یە.

تــرش:

خواردنی شتی ترش له خەودا کردنی کاری نابەدڵە. بەڵام ترش و شیرین.. خواردنی له خەودا خۆشک فرۆشتنە بە پارە کە زۆر ناڕەوایە.

تارمایی:

دیتنی هەر تارماییـک لە خەودا بە دواکەوتنی شتی بێ سوودە.

تەلــم:

دیـتنی لە خــەودا پــەیدا بــوونی درۆوو دەلەســەیە لە ناو خــەڵکی هەرنمەکە.

تەرزە:

بارینی لە خەودا خێرو خۆشی یە کە زیانی نەبێ بـەڵام ئـەگـەر زیانی هەبوو ئەوە هاتنی عەسکەری لاسارە بۆ وڵات.

تێ گوشین تلێت:

خواردنی تلێت لە خەودا دەوڵەمەندی یە. خـواردنـی تـلێتی گـۆشتی حەیوانێ کە حەلاڵ بێ کردنی خێرو خێراتە بە هەژاران بەڵام بـە گـۆشتی حەرام ئەوە کۆ کردنەوەی ماڵی حەرامە بۆ منداڵەکانی. کەسی لای وابوو تێکوشینی لایەو نای خوات ئەوە ماڵی خۆی ناخواتو دەبێتە میرات لە دوای خۆی.

تــاڵ:

خواردنی لە خەودا دزی کردنە لە بابی خۆیی کە ئەنجامی ریــوا دەبێ

تـــرێ:

خواردنی ترێی ڕەش لە خەودا تووش بوونی غەمە هی زەرد تووش بوونی نەخۆشی‌یە هی سوور تـەندروستی‌یە هـی سـپی ڕزقـی حـەڵاڵە.. گوشینی ترێ بۆ هەر شتێ هەبێ بەدەست کەوتنی مـاڵی دونـیایە لە لای پاشای وولات.

تاووس:

گرتوو بەدەست کەوتنی لە خەودا مارە کردنی ژنێکە کە منداڵی زۆر دەبێ فڕینی تاووس لە دەست هەر کەسێ لە دەست چوونی پلەی بەرزە: قـە کردنی تاووس لە گەڵ هەر کەسی بەدەست کـەوتنی پـایەی بـەرزە.. خواردنی گۆشتی تاووس خواردنـی مـاڵی حـەرامە کـە لە لایـان ژنێکی ڕەووشت پیس دەستی دەکەوێ:

تەپشـو:

بەدەست کەوتنی لە خەودا ئامۆژگاری کردنی خەڵکە بۆ کرداری باش خواری‌و کۆڵی تەپشـو مارە کردنی ژنێکی چەنە بازە کـە بـەهۆێ تـووشی دەردەسـەری دەبێ:

تێزاب:

خواردنی‌و کڕینی لە خەودا دەوڵەمەندی‌و ژیانی شادی‌یە.

تەیرە ئاوێلکە مریشکە ئاوی:

خواردنی‌و گرتنی لە خەردا دزینەوەی پارەی کۆنە کە خراوەتـە ژێـر

تیڵ:

بە کار هێنانی بە هەموو جۆری گەیشتنە بە ئاوات لە دوای دەردەسەری بە زۆری:

تی‌نیەتی تینوویەتی:

کەسێ لە خەودا لای وابوو تێ‌نی‌بوو ئەوە لە فەرمانی خوای لایداوە ئەگەر لای وابوو کەسێک ئاوی دایەوە ئەویش خواردی‌یەوە ئەوە یارمەتی دەدا بۆ ژن هێنان یا بۆ ئیشێکی دنکە. ئەگەر لای وابوو ئاوردەدا بە خەڵکی تێ‌نوو ئەوە پارە دەدات بە هەژاران بۆ خوا.

تەماتە:

خواردنی لە خەودا تووش بوونی غەمێکی کەمە هەڵ قەنی بڕ کە تەماتە ژن تلاقدانە. چاندنی تەماتە خۆشک بەشوودانە نابەدڵ ووشک بوونی بڕکی تەماتە مردنی ژنی خاوەنەکەیەتی.

تەیەموم:

کەسێ لای وابوو تەیەمرومی کرد بۆ نوێژ کردن ئەگەر ئاو هەبوو ئەوە کردنی ئیشێکی بێ شەرعی‌یە وە ئەگەر نا پتەوبوونی دینداری‌یە.

توتن:

چاندنی لە خەودا بەدەست هێنانی ماڵی دونیایە. کێشانی بە جگەرە قسە کردنی دژی ئاینی ئیسلامە:

تەندوور:

دروست کردن و نان پێ کردنی لە خەودا جێبەجێ کردنی فەرمانی خوابە ڕووخانی لە خەودا کەم دەستی خاوەنە کەیەتی.

تریان: تلیان، سەبەتە:

کردنی تلیان لە خەودا بۆ خوێندەوار دانانی کتێبی بە سوودە بەڵام بۆ نەخوێندەوار کردنی کاری بەسوودە بۆ کۆمەڵ...

تاعون:

کەوتنەوەی تاعورن لە وڵاتێک پەیدا بوونی شەڕو کوشتارە.

تەپڵ: دەهۆڵ:

لێدانی بۆ شایی و سەما تووش بوونی غەم و خەفەتە بۆ خەڵکی هەرنمەکە بەڵام بە بی سەما کردن لێدانی بڵاو بوونەوەی شتی بەسوودە.

تیمساح:

گۆشتی تیمساح خواردنی لە خەودا ماڵ خواردنی حەرامە لە لایان پاشای وڵات کوشتنی لە خەودا فەوتانی پاشای وڵاتە.

تازیە: سەرخۆشی: پرسە: شینگاه:

تازیە کردن لە کەسێک لە خەودا یارمەتی دانی ماڵ و منداڵی کەسەکە..یە دانیشتن لە سەر تازیەبە زیانی خۆشەو کامەرانییە: تازیەدانان بۆ مردووی خۆی ژن هێنانە یان بۆ کوڕی یان بۆ خزمێکی خۆی ئەگەر کەسێکی هەزار

لای وابوو تازیەی داناوە ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبێ بەهۆی بازرگانی.

تابووت:

بەدەست کەوتنی لە خەودا بۆ مەلا عیلمی زۆرە بۆ هەژار ماڵی زۆرە بۆ بازرگان سوودی زۆرە بۆ جووتیار دەرامەتی زۆرە بۆ کار بەدەست بەرز بوونی پلەیە: دانیشتن لە ناو تابووت ژیانی ئارامو خۆشی‌یە..

تەشی:

بەدەست کەوتنی تەشی کە جوان بێ مارە کردنی ژنێکی کابانوو ئارامە ڕستن بە تەشی بو خوێندەوار هۆنراوە دانانە بۆ نەخوێندەوار فێر بوونی پیشەسازی سووکەو بە سوودە. شکانی تەشی لە دەست چوونی ماڵی دونیایە بۆ خاوەنەکەی:

تەق تەق:

لە خەودا بیستنی تەق تەق لە هەرزنێک بڵاو بوونەوەی پڕوو پاکندەی میری‌یە کە بێ‌سوودە.

تێری:

کەسێ لای وابوو زۆر تێرە کە بە هۆی نووشی نارەحەتی بووە ئەوە زوو دەمرێ ئەگەرنا دەوڵەمەند دەبێ.

تۆبە:

کەسێ لای وابوو تۆبەی کرد لە خەوبا ئەوە برادەرایەتی مەلایان دەکار

سرودی زۆریان لێ وەردەگرێ دەربارەی ئایین.

**تەڕەساز: ترخێنە:**

خواردنی تەڕەساز لە خەودا بە قسە کردنی کەسێکە ئامۆژگاری خەراپە کردنی لێ دەکات وە ئەنجامی تووشی دەردەسەری دەبێ.

**تانۆک:**

تانۆک کردن بە داری تەڕ درووست کردنی مزگەوتە بەڵام بە داری ووشک موعامەلەیێکی زیان هێنەرە.

**تێر:**

دیتنو کڕینی تێرو جەواڵ و خرار لە خەودا برادرێکە کە زۆر ئاگاداری نهێنیەو و بڵاوی ناکاتەوە. دڕانی ئەوانە گرتنی برادەری زمان دڕاوە.

**تیر:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا هێزو دەستەڵاتە ئەگەر لای وابوو تیری گرتە شتێکو لێی نەدا ئەوە قاسیدێک بۆ ئیشێکی دەنێرێ کە ناکرێ ئەگەر ژنێک تیر بگرێتە پیاوێ ئەوە ژنەکە حەز لە پیاوەکە دەکات بەڵام پیاو تیر بگرێتە ژن ئەو بوختان بە ژنەکە دەکات.

**تەنگە نەفەسی: هەناسە تەنگی:**

تەنگە نەفەسی لە خەودا تووش بوونی ژیانی ناخۆشەو هەروەها قەردار بوونە بە زۆری.

**تەواف کردن:**

کەسێ لای وابوو لە دەوری ماڵی خوا تەواف دەکات ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان. تەواف کردن بە سواری جیماع کردنە لە گەڵ ژنێک کە پێی ناشێ بە شەرع.

**تفتیلک:**

گرتنوو کوشتنەوەو گوشتی خواردنی لە خەودا بوختان کردنە بە کچێکی پاک کە بەهۆی ئەو بوختانە دەکوژرێ.

**تــوو:**

خواردنی لە خەودا دینداری‌یە. چاندنی لە خەودا پارەدانە بە هەژاران بۆ خوا برینی داری توو لادانە لە فەرموودەی خوا. خواردنی هەموو جورە توو زۆر باشە بەڵام تووی زەرد نەخۆشی‌یە.

**تەرازوو:**

پێوانی شت بە تەرازو خێر کردنە بۆ مردووی خۆی: درووست کردنی تەرازوو زەکات دانی ماڵە کەسێ لای وابوو تەرازووی زێڕی دێت پەیدا بوونی عالمێکی دینی‌یە کە سوودی هەیە بۆ موسوڵمان.

**ترۆزی: خەیار: خرچە:**

خواردنی ئەوانە لە خەودا مارە کردنی ژنێکی کەم ئەرکە چاندنی ئەمانە لە خەودا بە دواکەوتنی کاری بێ سوودە.

تاداری نۆیەتێ:

کەسێ لای وابوو تووشی تاداری بووە لە خەودا ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان و خوا لێی دەبووری.

تف: خۆزی:

کەسێ لای وابوو لە خەویا کەسێک تفی پیاکرد ئەو کەسە بوختانی پێ دەکا تف کردن بە سەر زەویدا ژن مارە کردنە تف کردنە سەر دیوار ماڵ سەرف کردنە بۆ عەزاکردن. تف کردنە سەر دار جێبەجێ کردنی پەیمانە.

تــەون:

تەون کردن لە خەودا بۆ ژن شادییە. بەڵام بۆ پیاو غەمو دەردە.

ترپاک:

خواردنی لە خەودا لادانە لە ڕێ ڕاستوگرتنی ڕێ چەوتە لە ژیان.

تفنگ:

فراوانی لە خەودا ژیانی شادییە بەڵام تەنگی لە خەودا مردنی بە ناکاوە بوو خاوەنەکەی. هێشانی لە خەودا تووش بوونی غەمە:

تەشی ڕستن:

ڕستنی خوری بۆ ژن بەختیارییە لای میردی ئەگەر مێردی هەبێ ئەگەرنا گەیشتنە بە ئاوات. ڕستنی لۆکە خەیانەت کردنی ژنە بە مێردی خۆی ڕەستنی کەتان و کندر ئیش کردنە بەو ئامۆژگارییەی کە دەیکەن هەڵ ڕەشاندنەوەی ڕیسی ڕستراو پەیمان نەگەیاندنە جێیە.

تەڵە:

دانانی تەڵە بۆ گرتنی هەر شتێک نیڵ کردنە لە خەڵک. شکانی تەڵە دەرکەوتنی فێڵبازە لە ناو کۆمەڵ. گرتنی هەر شتێ بە تەڵە زاڵ بوونە بە سەر دوژمندا بە ئاسانی.

تەپۆڵکە گردۆلکە:

چوونە سەر تەپۆڵکە لە خەودا پشت بەستنە بە کەسێکی دیندار ڕووخانی مردنی کەسێکی بە سوودە بۆ کۆمەڵ.

تەموو مژ: تەمتومان:

پەیدا بوونی تەموو مژ لە هەرێمێک ڕوودانی کوشتارو شەڕە لە نێوان هاوولاتیان کەسێ لای وابوو تەموو مژ خانووەکەی داپۆشی ئەوە زۆر تاوانبارە بەرانبەر فەرمانی خوا تۆبە بکات باشە.

ترسان:

کەسێ لە خەودا لای وابوو ترسی هەیە ئەوە لەو شتەی ترسی لێ هەیە دەپارێزرێ.

تالان:

تالان کردن لە خەودا سەرپێچیە لە فەرمانی خوا.

تەویلە:

درووست کردنی تەویلە. لە خەودا خێر کردنە بە هەژاران. سواق دانی بە قوڕ کردنی تێر بازیبە ڕووخانی تەویلە بە جێ هێشتنی خانوو بەرەی

خزیەتی بۆ گوندێکی دوور کە بەمە تووشی زیان دەبێ.

تیشکی ڕۆژ:

دیتنی تیشکی ڕۆژ بە جوانی. ژیانی شادی‌یە بۆ کابرا ئەگەر لای وابوو تیشکی ڕۆژ شتێکی سووتاند ئەوە نرخی خواردەمەنی گران دەبێ.

تفەنگ:

بەدەست‌کەوتنی لە خەودا هێزوو دەسەلاتە: گوللە هاوێشتن بە تفەنگ بلاو بوونەوەی دەنگ و باسە دەربارەی دونیا.

تیمار کردن:

کەسێ لای وابوو لە تیمارخانە تیماریان کرد بۆ چاک بوونەوەی نەخۆشی ئەوە تیمار کراوە کە تۆبە دەکات لە گوناحان لە لای مەلایێکی بەرز دیتنی تیمارخانە لە خەودا بە دواکەوتنی فەرموودەی قورئانە.

# « پیتی جیم »

جێژنە:

کەسێ لە خەویدا لای وابوو کە جەژنی قوربانە ئەوە ڕزگاری دەبێ لە غەم و دەردەسەری. ئەگەر لای وابوو جەژنی ڕەمەزانە ئەوە ئەگەر زیانی ماڵی لێکەوتبێ خوا بۆی پڕدەکاتەو.

جوبرائیل:

درورودی خوای لێ بێ دیتنی لە خەودا ئەگەر ڕووی خۆشی بو ئەوە بە دواکەوتنی فەر موردەی پێغەمبەرانەو زیانی شادییە لە دونیادا بەڵام ئەگەر ڕووی گرژ بوو ئەوە خەرینەکە ڕوو دەکاتە کەم دینی. کەسێ لای وابوو جوبرائیل شتێکی دایە ئەوە بە شەهیدی دەمرێ و دەچێتە بەهەشت..

جەهەننەم دۆزەخ:

چوونی جەهەننەم لە خەوداکردنی گوناحی گەورەیە. ئەگەر لای وابوو کەسێک بردیە ناو جەهەننەم ئەوە هانی دەدات بۆ گوناح کردن. چوونی جەهەننەم و هاتنە دەرەوە تۆبە کردنە لە گوناحان. ئەگەر دەرگەوانی جەهەننەم خستیە ناو جەهەننەمەوە. ئەوە تەرکی نوێژ و ڕۆژوو زەکات دەکات. گرمەی ئاگری جەهەننەم و خستنە ناوی خەڵک ڕوودانی شەڕێکی ستەمە لە دونیادا کە زۆر کەس لەو شەڕە دەکوژرێ:

جەللاد:

کەسێ لای وابوو لە خەویا جەللادە ئەوە بوختان بە خەڵک دەکات: کوشتنی جەللادوو مردنی. بڵاو بوونەوەی یاسای ئیسلامە بە جوانی لە ناو کۆمەڵی ئادمیزاد.

جنوکە: ئەجندە: لەمەچێژ:

دیتنی جنۆکە لە خەودا قسە لەگەڵ کردنیان مانای وایە ئەو کەسە فێڵبازە و فێڵ لە خەڵک دەکات. ئەگەر لای وابوو هاتنە ماڵی و شتیان برد ئەوە دز بە ماڵی فێر دەبێ و زۆرزدار شتی لێ دەستێنێ. مارە کردنی ژنی جنۆکە دەوڵەمەند بوونە:

جۆلانە: داردەلامە:

سوار بوونی جۆلانە لە خەودا پیرور بروای خراپە بەرانبەر بە ئاینی ئیسلام بەر بوونەوە لە داردەمەلا تووش بوونی گوناحی زۆرە:

جرج: مشکە کوێرە

کوشتنی و گرتنی ڕزگاری‌یە لە حیلەی حیلەبازان. گۆشت خواردنی لە خەودا خواردنی ماڵی حەرامە. گرتنی و بەرەڵا کردنی سەفەر کردنە بۆ وڵاتی دووررو نەناسراو.

جوولەکە:

دیتنی لە خەودا ئەگەر پیناسی ئەوە فێڵ کردنە لە موسوڵمانان. بەڵام دیتنی جوولەکەکە نەیناسی ئەوە ئەولیای خوایە ئەگەر کەسێک لای وابوو بووتە جوولەکە ئەوە بەرانبەر بە موسوڵمانەتی دڵی پاک نیە.

جوانو: جوانیله:

کەسێک لە خەویا جوانووی مێ ببینی ئەوە ساڵێکی خۆش و بە دەرامەتە بەڵام جوانووی نێر پەیدا بوونی کوڕە بۆ خاوەنەکەی. سوار بوونی گەیشتنە بە ئاوات. مردنی لە دەست چوونی پایەی بەرزە بۆ خاوەنەکەی. خواردنی گۆشتی کردنی ئیشێکە ئابڕووی دەبا:

جەوت:

چنینی جەوت. بەدەست کەوتنی ڕزقی حەڵاڵە. خواردنی تووش بوونی نەخۆشی‌یە: هاڕینی خێر کردنە بە هەژاران:

جاترە: نەعنا کێویلە

خواردن و کردنی لە خەودا. موعامەلەی بێ دررو فێڵە: کە دەیکات

جەوەندە. کوندەی ئاو:

کەسێک نەخۆش ئەگەر لە خەودا کوندەی دەست کەوت ئەوە. چاک دەبێتەوە بۆبێ ژن ژن هێنانە. بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یە. دڕانی لە خەودا مردنی خاوەنەکەیەتی: کوندەی پڕ ئاو لە خەودا دیتنی ژنی ئاووسە کە کوڕێکی دەبێ. کوندەی ڕەش کە ئاوی تێدابێ تووش بوونی خاوەنەکەیەتی بۆ نەخۆشی و دەردەسەری:

جاڵ جالۆکە. داپیرۆکە:

دیتنی لە ماڵێک ژنێکی مەکربازە. کەسێ لای وابوو جاڵ جالۆکە کەوتە سەر زەوی ئەوە زستان زۆر ساردوو سەخت دەبێ: بزر بوونی جاڵ جالۆکە

لە هەرزنێک زۆر بوونی پیشەسازییە. ئەونی جالّ جالۆکە لە هەر جێگایێک پەیدا بوونی نەخۆشییە.

جووانی:

جوان بوون لە خەودا شادی و خۆشییە. ئەگەر ژنێک لای وابوو لە خەودا جوان بووە ئەوە زۆر بەختەوەر دەبێ لە ژیاندا.

جـۆلا:

کەسێک لای وابوو لە خەودا بووتە جۆلا ئەوە ئیشی خەڵک جێبەجێ دەکـات. جـۆلایی کـردن بـۆ خـوێنـدەوار دانـانی هـۆنراوەیـە بـەڵام بـۆ نەخوێندەوار ژیانی دەردەسەرییە.

جـەرگ: جگەر:

هێـانی جەرگ نەخۆشی منداڵی خاوەنەکەیەتی بڕین و ڕزینی مردنی منداڵی خاوەنەکەیەتی. خواردنی دەست کەوتنی تێن درووستییە.

جیوە:

بەدەست کەوتنی لە خەودا فێر بوونی زانیارییە. خواردنی لە خەودا ئازار دانی خەڵکی هەژارە بە بێ هەنجەت.

جیابوونەوە:

کەسێک لای وابوو لە ژنی خۆی جیابووە. ئەوە خۆشەویستی نێوانیان زۆر دەبێ. بەڵام جیا بوونەوە لە خزم و کەسی کردنی ئیشێکە کە دژی خزم و

جوانو: جوانیله:

کەسێک لە خەویا جوانووی مێ ببینی ئەوە ساڵێکی خۆش و بە دەرامەتە بەڵام جوانووی نێر پەیدا بوونی کوڕە بۆ خاوەنەکەی. سوار بوونی گەیشتنە بە ئاوات. مردنی لە دەست چوونی پایەی بەرزە بۆ خاوەنەکەی. خواردنی گۆشتی کردنی ئیشێکە ئابڕووی دەبا:

جەوت:

چێنی جەوت. بەدەست کەوتنی ڕزقی حەڵاڵە. خواردنی ترووش بوونی نەخۆشی یە: هاڕینی خێر کردنە بە هەژاران:

جاترە: نەعنا کێویلە

خواردن و کردنی لە خەودا. موعامەلەی بێ درۆو فێڵە: کە دەیکات

جەوەندە. کوندەی ئاو:

کەسێک نەخۆش ئەگەر لە خەودا کوندەی دەست کەوت ئەوە. چاک دەبێتەوە بۆ بێ ژن ژن هێنانە. بۆ هەژار دەوڵەمەندی یە. دڕانی لە خەودا مردنی خاوەنەکەیەتی: کوندەی پڕ ئاو لە خەودا دیتنی ژنی ئاووسە کە کوڕێکی دەبێ. کوندەی ڕەش کە ئاوی تێدابێ ترووش بوونی خاوەنەکەیەتی بۆ نەخۆشی و دەردەسەری:

جاڵ جالۆکە. داپیرۆکە:

دیتنی لە ماڵێک ژنێکی مەکربازە. کەسێ لای وابوو جاڵ جالۆکە کەوتە سەر زەوی ئەوە زستان زۆر ساردوو سەخت دەبێ: بزر بوونی جاڵ جالۆکە

لە هەرزنێک زۆر بوونی پیشەسازییە: تەرنی جاڵۆکە لە هەر جێگاییک پەیدا بوونی نەخۆشییە:

**جوانی:**

جوان بوون لە خەودا شادی و خۆشییە. ئەگەر ژنێک لای وابوو لە خەودا جوان بووە ئەوە زۆر بەختەوەر دەبێ لە ژیاندا.

**جـۆلاّ:**

کەسێک لای وابوو لە خەودا بووەتە جۆلاّ ئەوە ئیشی خەڵک جێبەجێ دەکات: جـۆلاّیی کـردن بۆ خوێندەوار دانانی هۆنراوەیە بەلاّم بۆ نەخوێندەوار ژیانی دەردەسەرییە.

**جـەرگ: جگەر:**

هێنانی جەرگ نەخۆشی منداڵی خاوەنەکەیەتی برین و ڕزینی مردنی منداڵی خاوەنەکەیەتی. خواردنی دەست کەوتنی تەن درووستییە:

**جیوە:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا فێر بوونی زانیارییە. خواردنی لە خەودا ئازار دانی خەڵکی هەژارە بە بێ هەنجەت:

**جیابوونەوە:**

کەسێک لای وابوو لە ژنی خۆی جیابووە. ئەوە خۆشەویستی نێوانیان [illegible] دەبێ. بەلاّم جیابوونەوە لە خزمو کەسو کاردا نیشانەیەکە دژی خزمەر

کەسی خۆی دەبکات.

جـرگ:

گرتنی لە خەودا مارە کردنی ژنێکی چەنەبازوو بێ هۆشە: کوشتنی لە خەودا تەڵاقدانی ژنەکەیەتی: خواردنی گۆشتی: خێر کردنە بە هەژاران.

جومعە:

کردنی نوێژی جومعە: حەج کردنە بە ماڵی حەڵاڵ. کەسێ لای رابور نوێژی جومعە دەکراو بەڵام ئەو نەچوو بۆ نوێژ کردن ئەوە ڕیایی دەکات لە دینداری. گوی گرتن لە ووتاری جومعە گرتنی ڕێبازی شەریعەتە: کردنی جومعە لە ناو شارو بازاڕو دەشتو شاخ تووشی بوونی خەڵکە کەیە بە بەڵایی دژوارو ناکاو. کردنی جومعە ڕوو بەرۆژ هەڵات یان ڕۆژئاوا یان بە ناتەواوی لادانی خەڵکە لە ڕێبازی قورئانی پیرۆزو دواکەوتنی شتی دژی ئیسلامەتی یە:

جەماعەت:

نوێژ کردن بە جەماعەت لە خەوداگرتنی فەرموودەی خوایە و مردنە لە سەر ئاینی ئیسلامەتی:

جیران: درواسێ:

دیتنی جیران لە خەودا بە شادی شادییە بە خەمباری غەمە شەڕ کردن لە گەڵ جیران زیاد بوونی خۆشەویستییە لە نێوانیان.

جەردە: ڕێگر:

گرتنی و کوشتنی جەردە لە خەودا بلاو بوونەوەی دادپەروەری‌یە زۆر بوونی جەردە لە هەرنمێک بەرگری کردنی خواپەرستی‌یە لە لایان هەندێ دەستەلاتدار:

جیقنە: ڕیخنە: ڕیوق:

کەسێک لای وابوو لە خەویا جیقنەی خوارد یان کەوتە سەر بەدەنی یان تەبرێک پێدا کرد ئەوە لە لای برادەرێک جلکی نوێی بۆ دێت بە دیاری کە دڵی پێ خۆش دەبێ:

جەڕەڕە: شەربە: گۆزە:

دیتنی جەڕەڕە کەر لە خەودا پیاوێکە کە منداڵە سوننەت دەکات یانی خەتەنە دەکات: کەسێ لای وابوو جەڕەزەی شکا ئەوە ژنەکەی دەمرێ ئاو خواردنەوە لە جەڕەڕە چوونی لای ژنی خۆیەتی کە لە حەیزدایە.

جووتمانە:

ئەگەر ژنێک لای وابوو دوو منداڵی پێکەوەبوو ئەوە ـ مێردەکەی زۆر دەوڵەمەند دەبێ ئەگەر کوڕ بن بەڵام ئەگر کچ بن ئەوە ژنەکە تووشی غەم دەبێ لە لای مێردی خۆیەوە بەهۆی هەوێ هێنانە بە سەریا:

جلیت بازی: کایە بە دار

کردنی جلیت بازی لە خەودا بە جێ هێنانی فەرمانی خوایەو تۆبە کردنە لە گوناحان بە ڕاستی:

جۆگا:

پاک کردنەوەی جۆگەی ئاو بە جێ هێنانی فەرمانی خوایە.. درووست کردنی جۆگا خوێندنی قورئانی پیرۆزە بە زۆری.

جەنجەڕ:

بەدەست کەوتنی لە خەودا ژن بە ژن کردنە لە گەڵ کەسێکی خاوەن عەشیرەت کە سوودی هەیە بۆ خەڵک:

# « پیتی چێ »

چارۆگە: سەرپۆش: کۆڵوانە:

ئەگەر ژنێک لای وابوو چارۆگەی جوانی لە خۆدا ئەوە لای مێردی بەڕێز دەبێ. ئەگەر پیاوی لای وابوو چارۆگەی لە خۆدا ئەوە تووشی بەڵا دەبێ. دڕانی چارۆگەی ژن هەژاری خاوەن ژنکەیە ئەگەر ژنێ لە خەودا لە لای خەڵک چارۆگەی لە سەر فڕێدا ئەوە ئێشێکی بێ ئابڕووانە دەکات.

چەمەن:

بنوارە مێرگ.

چەوری:

خواردنی چەوری حەڵاڵ لە خەودا دەست کەوتنی ماڵی حەڵاڵە بەڵام خواردنی شیربایی‌یە: سەر چەور کردنی بە ڕوون لە خەودا بە دوواکەوتنی فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) سمێڵ چەور کردن سوێند خواردنی بە دروویە: بەدەن چەور کردن بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە. خواردنی ڕوونی مەڕ لە خەودا دینداری یە هی بزن‌و گامیش‌و چێڵ دەست کەوتنی ماڵی دونیایە ڕژاندنی ڕوون بۆ سەرزەوی کردنی ئیشی بێ سوودە: خواردنی ڕوونی کەرە کوڕێکی باشە خوا دەیداتی ئەگەر ژنی هەبێ ئەگەر ناڕوو دەکاتە دینداری.

**چڵک: قرێژ:**

کەسێ لە خەوبا وابرو جلکی‌بان بەدەنی چڵکنە ئەوە بێ ئەمری خوای زۆر کردووە شوشتنی چڵک تۆبە کردنە لە گوناحان.. خواردنی قرێژ بە دوا کەوتنی نێربازی‌یە:

**چیچکەی گوێ: نەرمی گوێ:**

کەسێ لای وابرو چیچکەی کەسێکی گرت ئەو کەسە دەبێتە پشتگیری لە جێ‌بەجێ کردنی کاروباردا. هێشانی چیچکەی گوێ و برینی لە دەست چوونی برادەرێکی دڵسوزە.

**چنین:**

چنینی هەر رێنێک لە خەودا بۆ خوێندەوار دانانی شیعرە بەڵام بۆ نە خوێندەوار دەست کەوتنی ماڵی دونیایە:

**چەتر سەیوان:**

هەڵ گرتنی چەتر لە بەر باران لادانە لە فەرمانی خوا بەڵام لە بەر گەرما کردنی حەجە بە ماڵی حەڵاڵ.

**چەبکە گوڵ دەسکە گوڵ:**

کەسێ لای وابرو لە خەوبا ژنێک پیر چەبکە گوڵی دایە ئەوە کوڕی دەداتی ئەگەر ژنی هەبێت. بەڵام ئەگەر لای وابرو ژنێ گەنج دای‌پێ‌ی ئەوە ژنی خۆی تەڵاق دەدات ئەگەر لای وابرو پیاوێ دەسکە گوڵی دابی ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان.

چڵم:

ئەگەر کەسێک لە خەوندا لای وابوو چڵمی فڕێدایە سەرزەوی ئەگەر ژنی هەبێ ئەوە کچی دەبێ ئەگەر چڵمی بە ژنی خوێندا کرد ئەوە ژنەکەی منداڵێکی ناتەواوی دەبێ و نازی ئەگەر لای وابوو چڵمی بە ماڵێک دادا ئەوە لەو ماڵە یان ژنێک دەخوازێ یان خەیانەت بە ژنێک لە ماڵەکە دەکات. کەسێ لای وابوو چڵمی خوارد ئەوە ماڵی کوڕی خۆی دەخوات. زۆر هاتنی چڵم لە لوت قەرددانەوەیە. فڕێدانی چڵم بۆ لای راست پەیدا بوونی کوڕە بۆ لای چەپ کچە: فڕێدانی چڵم بۆ سەر جێگەی کەسێک خەیانەت کردنە لە گەڵ کەسەکە.

چەرم: چاندن: تۆودان:

خواردنی لە خەودا داهاتنی گرانی نرخی خواردەمەنی یە. لە بەر کردنی چەرم کردنی کاری بێ سوزدە تۆودانی زەوی ئاووس بوونی ژنەکەیەتی بە مەرجێ زەوی هی خوێ بێ. بەڵام تۆودان لە زەوی کەسێک خەیانەت کردنە بە ژنەکەی خاوەن زەوی یە کە چانی تۆو لە سەر لە پی دەست کردنی تیربازی یە ئەگەر لای وابوو لە هەرنمێک درووی نەیان دەکردو وەختی نەبوو ئەوە مردن لەو هەرنمە زۆر دەبێ. گەران لە ناو کێڵگەی سەوزدا تووش بوونی غەزایە بۆ خوا ـ ئەگەر لای وابوو ئەو تۆوە چاندوویەتی شین بوو ئەوە زۆر دینداری دەکات. چاندنی گەنم و جۆ زۆر باشە ئەگەر لای وابوو ئەو تۆوەی چاندی شین نەبوو ئەوە ژنەکەی نەزۆکە:

چـــاو:

ڕووناکی چاو لە خەودا دینداری یە بە زۆری. کوێر بوونی کەم دینی یە.

کوێر بوونو چاک بوونەوە تۆبە کردنە لە گوناحان. بوونی یەک چاو کردنی گوناحێکی زۆر گەورەیە کڵ لە چاو کردن بە دەست کەوتنی پایەی بەرزە هەبوونی چاری زۆر بە دەست کەوتنی پلەی ئەولیای خوایە بە مەرجێ بە هەموویان بینێ: هێشانی چاو ـ لادانە لە فەرمانی خوا:

چــری:

کەسێ لای وابوو بەدەنی چرچ بووە ئەوە تووشی هەژاری دەبێ:

چەوەندەر:

خواردنیو چاندنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵی حەلاڵە.

چەپەر:

بنوارە تانۆک:

چۆپە: چەپ

کەسێ لای وابوو شتی باش و بەرزە بەدەستی چۆپە دەکات وەکو نان خــواردنو قــورئان هــەڵ گــرتنو تــەسبیحات کـردن ئـەوە لایداوە لە فەرموودەی پێغەمبەری ئیــسلام (د.خ).

چارداغ:

کردنی چارداغ لە خەودا کارکردنی بەسوودە. تێک چوونی چارداغ لە دەست چوونی ماڵی دونیایە سوتانی چارداغ لە هـاوینـدا مـردنی ژنـی خاوەنەکەیەتی بەڵام لە زستاندا دڵدارییە لە گەڵ بێوەژنێک کە زیانی لە دەست دەبینێ.

چادر: خێوەت: تاوڵ:

بەدەست کەوتنی چادری نوێ ژن هێنانە. دیتنی چادری سپی و سەوز زیارەت کردنی گۆڕی شەهیدانە. کەسێ لای وابوو چادری خۆی پێچایەوە ئەوە زوو دەمرێ هاتنە دەر لە بن خێوەت یان کەوتنی خێوەت لە دەست پلەی بەرزی خاوەنەکەیەتی: سووتانی خێوەت لە هەرێمێک پەیدا بوونی شەڕوو کوشتارە لەو هەرێمە..

چەمانەوە: داهاتنەوە:

کەسێک لای وابوو لە بەردەمی کەسێک داهاتەوە ئەوە کارێکی لەپێشە کە پێویستی بە یارمەتی دان هەیە بۆ جێبەجێ کردنی.

چەپڵە:

چەپڵە لێدان لە ئاهەنگدا لە گەڵ خەڵک شادییە بەڵام بە تەنیا چەپڵە لێدان توش بوونی خەمی زۆرە.

چــرا:

دیتنی ڕووناکی چرا لە خەودا زیانی خۆشە. کوژانەوەو کز بوونی چرا هەژاری خاوەنەکەیەتی. کوژانەوەی لە دەست نەخۆش مردنی نەخۆشەکەیە گرتنی چرا بە دەستەوە دینداری زۆرە پەو گرتنی ڕێبازی دیندارانە.

# « پیتی حێ »

حفصة ژنی پێغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا بۆ پیاو تووش بوونی غەمە بەڵام بۆ ژن بەختیاری‌یە هەروەها بە خزمەت گەیشتنی هەر ژنێک لە ژنانی پێغەمبەر هۆی شادی و خۆشی‌یە.

حەسیر:

درووست کردنی لە خەودا تووش بوونی ئێشێکی بە زەحمەتە بەڵام ئەنجام باش دەبێ نوێژ کردن‌و لە سەر دانیشتنی لە خەودا کردنی کاری بەسوودە بۆ خۆی‌و کۆمەڵەکەی.

حەج کردن:

حەج کردن لە کاتی خۆی بە جێ‌بەجێ کردنی هەموو مەرجەکانی‌یەوە ئەوە ڕەزامەندی خوایە لەو کەسە ئەگەر لای وابوو هەر بە تەنیا دەچێ بۆ حەج‌و خەڵک بەڕێی دەکرد ئەوە بە زوویی دەمرێ کردنی حەج‌و عەمرە بەیەکەوە تەمەنی درێژوو دانەوەی ئەسپاردەی خەڵکە بە تەواوی.

حەمام: گەرماو:

چوون بۆ حەمام لە خەودا غەمێکە بۆی ڕوو دەدات لە لایان ژنی‌یەوە..

درووست کردنی حەمام لە خەودا دامێن پیسی یە دەیکات کەسی لای وابوو لە حەمام دانیشتوو کۆمەڵی بە دەورەوە بوو ئەوە زینا دەکات لەگەڵ ژنێک ئاشکرا دەبێ: ئەگەر ژن و پیاو پێکەوە بەڕووتی چوونە حەمام لە جێگایی ئەوە خەڵکی ئەوی تووشی بەلا دەبن. درووست کردنی حەمام لە جێگایی پەیدا بوونی ژنێکی داوێن پیسە لەو گەڕەکە:

حەیران:

بنوارە گۆرانی:

حەلوا:

خواردنی لە خەودا دین پەرستنە بە دڵسۆزی:

حیلەحیلی ئەسپ:

لە خەودا حیلە حیلی ئەسپ سەرکەوتنی موسوڵمانانە بە سەر کافردا لە غەزا کردن.

حیزی:

تووش بوونی ئەم ڕەووشتە لە خەودا جاسووسی کردنە لە سەر کەسێکی کە پشت گیری خۆی دەکات.

حەسانەوە:

کەسی لای وابو لە دوای ماندوبون حەسایەوە ئەگەر نەخۆش بوو دەمری، ئەگەر قەرزار بو قەرز دەداتەوە، ئەگەر غەمبار بو شادی ئەبێ.

حەواڵە:

کەسێ لای وابوو لە خەوریا شتێکیان حەواڵە کردە سەری ئەوە داخوازی کچی یان خۆشکی لێدەکەن بەڵام نەیدات باشترە:

حاجی لەقلەق:

کوشتنو گرتنی لە ناودانی دووژمنێکی گەورەیە نیشتنەوەی حاجی لەقلەق لە سەربانی هەر کەسێک دەعوەت کردنی پیاوێ مەزنە بۆ نان خواردن. قسە کردنی لەقلەق پەیدا بوونی کاری سەر سوڕهێنەر گرتنی لەقلەقو ئارام کردنی لە ماڵەوە پەیدا کردنی برادەرێکی ئارامە:

حلیمة السعدیة:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا بۆ پیاو ژن هێنانە بەڵام بۆ ژن پەیدا بوونی کوڕێکی نازدارو قەشەنگە:

# « پیتی خێ »

خضر:

بە خزمەت گەیشتنی خضری زیندە درووودی خوای لێ بێ بەرووی گەشەوە ئەوکەسە حەج دەکات: دینی لە هەرێمێک خۆشی و هەرزانی‌یە..

خەدیجە:

بە خزمەت گەیشتنی خاتون خەدیجە خێزانی پێغەمبەری مەزن (محمد) درووودی خوای لێ بێ ئەوە ڕیباز گرتنی خوا پەرستی‌یە. ئەگەر شتێکی دابە کەسێک ئەوکەسە لە سەر ئاینی ئیسلام دەمرێ:

خانەقا: تەکیە:

جوانی و پەرداخی تەکیەو خانەقا لە خەودا لە هەرێمێک پەرەسەندنی دینداری‌یە ڕووخانی کز بوونی دینە چوونە ناو خانەقا پتەوی ئیمانە.

خەتیب: ووتار: بێژ:

کەسێک لای وابوو ووتاری نوێژی هەینی دەدات ئەوە پایەی بەرزی دەست دەکەوێ بەڵام ئەگەر ووتار دەرەکە ژن بوو ئەوە مێردەکەی تەڵاقی دەدات و ژنە کەش لە زینا کردن پیرۆوو فرێدەدات ئەگەر کەسێک بێ ژن ووتار بدات ژن دەهێنێ:

**خەنجەر:**

بەدەست کەوتنی خەنجەری جەرهەردار هێزوو دەستەڵاتە. شکانی هەژاری‌یە. خەنجەر نانەوە لە کالان بۆ کەسێک بێ ژن ژن هێنانە کەسێ خەنجەری خۆی لە نار کالانی خەنجەری کەسێک بنێ لە خەودا ئەوە زینا دەکات:

**خەڵات:**

بنوارە پاداشت.

**خەرتەلە:**

خواردنی لە خەودا ئەوە کەسێک دەیەوێت بە ناوی دۆستایەتی ژەری بداتێ.

**خۆخ:**

خواردنی لە خەودا ئەگەر شیرین بوو شادی‌یە ئەگەر تاڵ بوو غەمە ئەگەر مزر بوو تووش بوونی ترسە لە لایان ناحەز چاندنی ئەمامی خۆخ یارمەتی دانی هەژارانە بە ماڵی دوونیا ووشک بوونی داری خۆخ مردنی پیاوێکی خێر کەرە لە هەرێمەکە:

**خرنووک:**

زۆربوونی برکی خرنووک لە گوندێک تێک چوونی گوندەکەیەو چۆل بوونیەتی خواردنی بۆ نەخۆش چاک بووەنەیە بەڵام بۆ لەش ساغ سەرف کردنی ماڵە بۆ کەسێک نە سوودی دونیای هەیە نە هی قەیامەت.

خاش خاش:

بەدەست کەوتنو بۆن کردنی گوڵی خاش خاش بەدەست کەوتنی ماڵی قومارە ووشک بوونی لە خەودا لە ناو چوونی پاشای وولاتە.

خشەخش:

کەسێک لە خەودا ئەگەر گوێی لە خشەخش بوو ئەوە کەسێک دەیەوێ حیلەی لێ بکاتو ژنەکەی یان کچی هەڵ خەڵەتێنێ.

خودە: کڵاوی ئاس:

لە سەرنانی خۆدە بۆ سەرباز زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا شکانی خۆدە بێ دەستەڵاتی خاوەنەکەیەتی. خودەی سپی لە سەرنان مردنە بە پلەی شەهید بوون: خودەی پۆڵاو ئاسن لە سەرنانی گەیشتنە بەو مەبەستەی خەباتی بۆ دەکات.

خورما:

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی رزقی حەڵاڵە بەڵام بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە ووشک بوونی داری خورما تووش بوونی خەڵکەکەیە بە هەژاریو بێ دەرامەتی کردنی خورما بە دۆشاو خوێندنی قورانی پیرۆزە بە زۆری هەڵقەندنی داری خورماو بڕینی پەیدا بوونی گرانی نرخی خواردەمەنی یە.

خــوێ:

خواردنی لە خەودا شادی یە بە خوێ کردنی ماسی لە خەودا مارە

کردنی ژنێکی قزە تێک چوونی کانی خوی لە هەرنمی پەیدا بوونی دەردێکی ساماکە کرینی خوێ ناوبژ کردنە بۆ ئاشتی خەڵک خوێ کردنی زەیتون جێ‌بەجێ نەکردنی بەڵێنە فرۆشتنی خوێ ئامۆژگاری‌یە بە چاکە کردن بۆ خەڵک:

خرخاڵ: پاوەن: خرینگە:

لە پی کردنی بۆ پیاو لە خەودا دەردوو بەڵایە. بۆ ژن بەختیاری‌یە لە پێ کردنی خرخاڵی ئاسن بۆ پیاو تووش بوونی حەبسە لە لایان میری‌یەوە بەڵام زوو رزگار دەبێ:

خەندەک:

لێدان خەندەک لە دەوری شارو گوند لە خەودا بەرزی پاشای وولاتە بەڵام لە دەوری ماڵ ئەمین بوونی خاوەن ماڵە لە حیلەی حیلە بازان کەوتنە ناو خەندەک غەمە. هاتنە دەر لە خەندەک شادی‌یە:

خەسوو:

کەسی لای وابوو لە گەڵ خەسووی شەڕ دەکات ئەوە ژنەکەی لە لاپەڕێز دەبێ مردنی خەسووی کەسێک لە خەودا شادی کەسەکەیە بەهۆی گوێ ڕانیلی ژنەکەی:

خەساندن: بێ گون:

کەسی لای وابوو خەساندوویانە ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان ئەگەر لای وابوو کەسێکی خەسیوی جوان شتێکی دایە ئەوە مژدەی خۆشی بۆ

دیت خەساندن دینداری ڕاستە کە بەهۆی ئەو دینداری‌یە دەگاتە پلەی ئەولیایانی خوا:

خونسابوشکیل: نیرەمووک:

کەسێک لە خەودا لای وابوو نیرە مووکە هەردوو لای هەیە هی پیاوانو هی ژنان ئەوە دوورڕوویی دەکاتو کرداری نالەبار دەکات. مارە کردنی نیرەمووک تەڵاقدانی ژنە کەیەتی ئەگەر ژنی هەبێت ئەگەر نازێک مارە دەکات کە تووشی غەمو ئاژاوەی دەکات.

خاچ: چەلیپا:

هەڵ گرتنە چەلیپا مارە کردنی ژنێکە کە بە گرێی شەریعەت مارەیی نەهاتووە. لە مل کردنی خاچ لادانە لە دینی ئیسلام فڕیدانی خاچ تۆبە کردنە لە تاوانباری.

خوانە:

نانکردن لەسەر خوانە بۆ ژن بەجێ هێنانی فەرمانی مێردیەتی. بەڵام بۆ پیاوکردنی کشت و کاڵی بەسوودە. خوانەی دار کەسێ لە خەودا بەدەستی بکەوێ دەوڵەمەندی‌یە بەڵام هی ئاسن لادانە لە ڕێبازی پیار چاکانو هاتوو چۆ کردنی زۆر دارانە: شکانی خوانە. هەژاری خاوەنەکەیەتی.

خاڵ:

هەبوونی خاڵ لەڕوو لە خەودا بۆ کوڕ ژن هێنانە بۆ کچ شوو کردنە بۆ ژن شادی‌یە. بۆ پیاو دەوڵەمەندی‌یە بەڵام خاڵی زۆر لە سەر بەدەن بیر

کردنەوەیە لە شتی بێ سوود:

خەزور:

دیتنی لە خەودا بە شادی شادی‌یە بە غەمباری غەمە. مردنی خەزور لە خەودا لە دەست چوونی ماڵو پلەیە:

خاڵو:

دیتنی لە خەودا بە ڕوو خۆشی بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە. بۆ لەش ساغ گەیشتنە بە ئاوات. مردنی لە خەودا ئازاردانی بابو داکە ئەگەر هەبێ دەنا تووش بوونی دەردە سەری‌یە:

خەنە:

ئەگەر پیاوێک سەرو سمێڵو ڕیشی لە خەتەدا ئەوە بە دووای ڕەوشتی پی غەمبەر دەکەوێ چاندنی خەنە لە خەودا ڕابواردنی خۆشە لە گەڵ ماڵو منداڵی خۆی ئەگەر کچێ لای وابوو سەری لە خەنە گرت ئەو میردی باش دەکات بە سەر بەرزی.

خورشت: خوران:

کەسێ لای وابوو لە خەودا تووشی خورشتی بەدەن بووە ئەوە زۆردارێک زۆری لێدەکات بۆ کردنی کاری ستەمە.

خزم: خوێش:

دیتنی خزم لە خەودا بە شادی شادی‌یە بە غەمباری غەمە.

خوێن:

کەسێک لای وابوو بەدەنی بە خوێن بوو لە خەودا ئەوە ماڵی حەڵاڵو حەرام لێکدەدات. خواردنەوەی خوێنی ئادمیزاد تەن درووستی یە کەسێک لای وابوو کراسی خوێناوی کردە بەر ئەوە بوختانی پێ دەکرێ بەڵام لە ئەنجامدا دەردەکەوێ کە لەو بوختانە دوورە. کەسێ لای وابوو لە جێگایێ خوێن دەڕوات ئەوە ئەو کەسە لەوی دەکوژرێ. ئەگەر لای وابوو خوێن لە پاشی یەوە دێتە دەرێ ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحانو خواش لێ ی دەبوورێ: ئەگەر لای وابوو کەسێک خوێنی لە بەدەن گرت یان ئەو خوێنی لە کەسێک گرت ئەوە خوێن لێ گیراوە کە دەبێتە کار بەدەستی میری ئەگەر کەسێک ویستی خوێن لە کەسێک بگرێ بەڵام خوێن نەهات ئەوە خوێن گرەکە هەندێ زێڕی شاردووتەوە بەڵام نازانی جێگەکەی کوێ یە: نەخۆش ئەگەر لای وابوو خوێنی بەدەنی گیرا ئەوە لە نەخۆشی چاک دەبێتەوە.

خێلی:

خێل بوونی چاو لە خەودا لادانە لە فەرمانی خوای گەورە تۆبە بکات باشە.

خواردن:

خواردنی هەر شتێک لە خۆ زیاتر کردنی کاری ناشیرنە لە ناو کۆمەڵ بەڵام بە قەدەر برسی یەتی گەیشتنە بە ئاوات.

خوێندن:

بە هەموو جۆرێ خوێندن لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزە.

خەوتن: نووستن:

خەوتن لە خەودا بە دەست کەوتنی ژیانی شادی و ئارامو دڵنیایی‌یە.

خۆ ڕووت کردن:

کەسێ لای وابوو خۆی ڕووت کرد لە جلک ئەوە ئەو کارەی لای ستەمە خوا بۆی ئاسان دەکات.

خانوو:

دەست کەوتنی خانووی جوان لە خەودا شادی‌یە. خانووی ئاسن دەوڵەمەندی‌یە بەڵام خانووی قوڕ دینداری‌یە: خانووی قــڵو گێچ تووش بوونی غەمە کەسێک لای وابوو چووە خانوو بەڵام نەی‌توانی دەرچێ ئەوە زوو دەمرێ ئەگەر لای وابوو کەسێک هاتە ناو خانووی ئەو ئەوە ئەو کەسە لە هەموو نهێنی ئەو ئاگادار دەبێ: کەسێ لای وابوو خانووی کۆنی بە سەردا ڕووخا ئەوە لە لایان خزمێکی مردووی میراتێکی زۆری دەست دەکەوێ فرۆشتنی خانوو ژن تەڵاقدانە: خانووی تەنگ ژیانی ناخۆشە بەهۆی ماڵو منداڵی کەسێ لای وابوو نەخۆشەو لە ناو خانوو کەوتووە ئەوە دەمرێ سواق دانی خانوو مارە کردنی بێوەژنە:

خێر کردن:

لە خەودا خێر کردن بە ماڵ بۆ هەژاران بڕوای پتەوە بە خوا خێر کردنی بەرزی تۆبە کردنە لە گوناحان. کەسێ لای وابوو خێر بە کافر دەکا ئەوە یارمەتی دانی دوژمنی خۆیەتی: خێر کردن بە خزمو کەسو دایک و باب ڕەزامەندی خوایە:

خێڵەکی: کۆچەر:

کەسێک لای وابوو بووەتە کۆچەر ئەوە ئەو لە بەرهەمی کشت و کاڵ سوودی کەم دەبێ: دیتنی هۆزەی کۆچەریان پەیدا بوونی ڕقەبەری‌یە لە گەڵ خزم و کەسی بە هۆی بە مێرددانی کچی خۆی.

خەت کێشان:

کەسی لای وابوو لە سەرزەوی خەت دەکێشێ ئەوە دەبێتە جووتیارێک زۆر دەولەمەند بەڵام خەت کێشان لە سەر چەرم نێر بوونی پیشەسازی‌یە لە سەر قاقەز نێر بوونی نووسینو خوێندنە یان خۆی یان خزم و کەسی.

خۆشاردنەوە چاوشارکێ:

کەسێک لای وابوو لە خەودا لە ناو خانوو خۆی شاردەوە ئەوە لە دینداری ڕیایی دەکات. بەڵام ئەگەر لای وابوو لە ناو کێوێ خۆی شاردەوە ئەوە بەهۆی کەسێکی دەستەڵاتدار بە سەر ناحەزاندا زاڵ دەبێ.

خەرمانەی دەوری: مانگ و ڕۆژ:

ئەگەر لای وابوو خەرمانەی دەوری مانگ یان ڕۆژی داوە وتاریکی کردووە ئەوە بۆ خەڵکی هەرێمە کە پەیدا بوونی بەڵایە: بەڵام ئەگەر خەرمانە ڕووناکی نەبرد بوو ئەوە ئێش کردنی کاربەدەستانی میری‌یە بەداد پەروەری:

خەریتە: نەخشە:

کەسێ لە خەویا خەریتەی وڵاتێکی کێشا ئەگەر بە ڕەنگی سپی بوو

ئەو وولاتە تووشی خۆشی دەبێ: بەڵام هی ڕەش و سووررو بۆر تووشی خەڵکی وولاتە بە دەردێکی سامناک وە بە ڕەنگی سوور پەیدا بوونی شەڕوو کوشتارە لە وولاتە کە خۆبەخۆ.

خوێزاو: کێم: زوخاو:

کەسێ لای وابوو زوخاوی لە بەدەن یان لە ئەندامێک دێت بەڵام هێشتی نەبوو ئەوە زۆر زۆر دەوڵەمەند دەبێ: خواردنی زوخاو: خواردنی شیربایی یەو نەدانی میراتی خۆشکورو داکێتی.

# « پیتی دال »

داود پێغەمبەر د.خ:

بە خزمەت گەیشتنی و دەست ماچکردنی بە ڕوخۆشی: نیشانەی مردنە لە سەر دینی ئیسلام: بەڵام بە ڕوو گرژی کردنی ئیشێکە کە زۆر پەشیمانی لە دوایە: هەروەها بە خزمەت گەیشتنی زۆربوونی پیشەسازی‌یە لەو هەرێمە:

دانیال پێغەمبەر د.خ:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا فێر بوونی خەون لێکدانەوەیە.

دوعا: نزا: پاڕانەوە:

کەسێ لای وابوو لە خەودا لە بەر خواپاڕایەوە ئەگەر ئەو کەسە ژنی هەبوو منداڵی نەبوو خوا کوڕی دەداتی ئەگەر ناباوەڕوای بە خوا پتەو دەبێ: دوعای بە دەنگ و هاوار تووش بوونی دەردوو بەڵایە:

دیلی: یەخسیری:

کەسێ لای وابوو لە لایان کۆمەڵێک بەدیل گیرا ئەوە دەوڵەمەند دەبێ ئەگەر ئەو کەسێکی بە دیل گرت ئەوە شتی نهێنی میری دەزانێ.

**درۆ کردن:**

درۆ کردن لە خەودا شاهیدی دانی بەدرۆیە بەبەرتیل وەرگرتن.

**دووکەڵ:**

کەسێک لای وابوو لە هەرێمێک دوکەڵبو پەیدا بوونی غەمو بەڵایە.. دووکەڵی ڕەش کە ئاگری لە گەڵابێ پەیدا بوونی هاتنی شەڕو کوشتارە بۆ جێگەکە: چوونە ناو دووکەڵ تروش بوونی تاداریبە: دووکەڵی سپی شادی‌یە.

**دەرمان:**

خواردنی دەرمانی بۆن خۆش بۆ نەخۆش چاک بوونەوەیە. بۆ بێ‌ژن ژن هێنانە. بۆ کچ مێرد کردنە بۆ بێ منداڵ پەیدا بوونی منداڵە بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یە.

**دەجاڵ: تەجاڵ جرجاڵ:**

هاتنی لە خەودا بۆ هەر جێگایێک زۆر بوونی کرداری دژی ئیسلامە بە دواکەوتنی لادانە لە فەرمانی خودا. کوشتنی بە دەست هەر کەسێک بەرز بوونی ئایینی ئیسلامەتی‌یە.

**دەفتەر:**

بەدەست کەوتنو لێ نووسینی دەفتەری جوان گەیشتنە بە ئاوات.

**دوکان:**

دانیشتن لە دووکان بە دڵ خۆشی مارە کردنی ژنێکی مەسەنە... ئەگەر

لای وابوو دوکانی لەتە بشت مالّی خۆبەتی ئەوە برادەریکی حەز لە ژنەکەی دەکات.

دەفە:

لێدانی دەفە لە خەودا بۆ زکر کردن بە جێ هێنانی فەرمانی خوابەو فەرمان کردنە بە چاکە بەلاّم لێدانی بۆ ئاهەنگی نالەبار لادانە لە فەرمانی خوا.

دێرە:

کەسێ لای وابوو لەگەلّ دیانان چووە دێرە ئەگەر دیانەکان بناسی ئەوە لادانە لە فەرمانی ئیسلام وە ئەگەر نەیان ناسێ ئەوە دینداری ڕاستەقینەیە کە دەیکات: ئەگەر نەخۆش لای وابوو چووە دێرە ئەوە دەمرێ.

دەردە ڕێوی:

کەسێ لە خەودا لای وابوو تووشی دەردە ڕێوی بووە ئەوە پلەی نزم دەبێت لە ناو کۆمەلّ بەهۆی فێلّ بازی بەلاّم تووش بوونی دەردە فیل بەرز بوونی پلەیە:

دۆشەک:

نووستن لە سەر دۆشەک لە خەوا ژیانی شادیو کامەڕانی‌یە.

دوورپشک کلاّژدووم:

پێوەدانی دووڕشک لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزی بێ دەوامە کەسێک لای وابوو دووڕشکی خستە سەر ژنەکەی ئەوە لە پشتەوە کاری لە

گەڵ دەکات. خواردنی دوویشک بە کوڵاوی دەست کەوتنی میراتە بەڵام بە کاڵی ماڵی حەرامە کەسێ لای وابوو دوویشک لە سەر جێگەی نووستنی ئەوە لە ناو دەرپی‌بەتی ئەوە کەسێک خەریکە خەیانەت لە گەڵ ژنەکەی بکات. بە دەستەوە گرتنی دوویشک بۆ پێوەدانی خەڵک دووزمانی کردنە لە نێوانی خەڵک. پێوەدانی دوویشک زیانی لە لایان ناحەزەوە. کەسێ لای وابوو دوویشک لە ناو زگی دایە ئەوە ماڵو منداڵی خۆی ڕقیان لێ‌یەتی: دووژمنایەتی دەکەن.

دەلاقە تاق:

دانیشتن لە ناو دەلاقە بۆ خاوەن ژن تەڵاقدانی ژنەکەیە: بۆ خاوەن کارێک وازهێنانە لەو کارە کەسێک لای وابوو لە دیواری خانووەکەی دەلاقەی هەبە بەڵام بە شووشە گیرابوو ئەو کەسە نەمامی داری بە ردار دەچێنیو سوودی لێ دەست دەکەوێ. دەلاقەی تەنگ ژنی چەنەبازە. هی فراوان ژنی ئارامە. ڕووخانو خەراپ بوونی دەلاقە تەڵاقدانی ژنی خاوەنەکەیەتی.

دەرد: نەخۆشی:

تووش بونی دەردێک لە خەودا کەم دیتی‌یە بەڵام چاکبوونەوە لە دەردەکە تۆبە کردنە لە گوناحان:

دونیـــا:

کەسێک لە خەویا لای وابوو دونیا ڕەش بووە ئەوە خەڵک بە زۆری ڕووی کردووتە کەم دینی: بەڵام سەوزی دونیا خواپەرەستنە بە زۆری

کەسی لای وابــرو لە دونــیا ناکەس نەماوە خزی نەبێ ئەو کەسە هەردووچاوی کوێر دەبی جوانی دونیا لە خەودا بەدەست کەوتنی دیناری زورە بوهژار عیلمی زورە بو خویندەوار

دینـــار:

بەدەست کەوتنی یەک دینار لە خەودا پەیدا بوون یەک کورە بەڵام بەدەست کەوتنی دیناری زۆر بۆ خوێندەوار عیلمی زۆرە بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یە. دەست کەوتنی دیناری زێڕ پایەی بڵندە هی زێڕ باف حیلە کردنە لە خەڵک لە موعامەلەدا خواردن دینار خەیانەت لە ئەسپاردەی کەسێک لای وابرو مردوو دیناری دایە ئەوە لە غەمو پەژارە ڕزگار دەبێ دۆزینەوەی دینار دینداری‌یە. لێ بزر بوونی کوڕ مردنە:

درهەم:

بەدەست کەوتنی درهەمی زێڕ خوێندنی قورئانی پیرۆزە لێ بزر بوونی درهەم کوڕ مردنە درووست کردنی درهەم. تووش بوونی غەمە.

دێ: گوند:

کەسێ لای وابرو لە گوندێک چوو بۆ شار ئەوە تووشی خۆشی دەبێ وێران بوونی گوند بێ ئەمری کردنی خوایە جوانی دینداری‌یە.

دیــزە:

کەسێ لای وابرو دیزەی لە سەر ئاگردانارەو خواردنی تێدایە ئەوە ئامۆژگاری کردنی خەڵکە بۆ چاکە کردن بەدەست کەوتنی دیزەی پڕلاوو

ئاسن پلەی بەرزەکە دەستی دەکەوێ.

دەست:

کەسێک لای وابوو لە خەودا دەستی درێژ بووە ئەوە پلەی بەرزی دەست دەکەوێ. دەستی زۆر هێزور دەستەڵاتە: شکانی دەست بێ دەستەڵاتی یە ڕۆیشتنی لە سەر دەست جێ بەجێ کردنی کاری خزمەکانی خۆیەتی:

کەسێک لای وابوو هەردوو دەستی بەستراو. ئەوە بێدەستەڵاتی یە پاش کردنەوەی بەری دەست ماڵ بەخشینەوەیە بۆ خوا قوچاندنی دەست نەدانی زەکاتە کورت بوونی دەست بێ دەستەڵاتی یە: ڕووناکی دەست پایەی بەرزە لە دینداریدا. بڕینی دەست لە خەودا ناحەزێکە دەیەوێت فێڵ بکات لەو کەسەی کەلای وایە دەستی براوە لە لایان ئەوەوە هێنان دەست. خەم و خەفەتە تووشی دەبێ لە لایەن خزمی خۆی:

داستان: چیرۆک حەکایەت:

خوێندەوەی داستان لە خەودا خەریکبوونی شتی بێ سوودە نووسینەوەی. داستان تەمام چاندنە لە ناو باخات..

دەستار:

لێکردنی شت بە دەستار، بۆ پیاو هەژاری یە. بەڵام بۆ ژن بەختیاری یە:

دڵ = دڵ:

کەسێک لای وابوو لە خەودا دڵی دێشێ ئەوا ڕیایی کردنی لە دینداریە

هاتنە دەری دڵ لە خەودا. خواپەرستی بە راستی یە رەشبوونی دڵ لادانە لە فەرموودەی قورئانی مەزن دڵ خۆشی لە خەودا. ژیانی شادی یە.

ددان: دڵان دان:

جوانی ددان لە خەودا بەرزی کەسوو کاری خاوەن ددانە. کرمۆڵ بوون و شکانی ددان هەژاری خزمی خاوەن ددانە: کەوتنی هەموو ددان بە یەکجار دانەوەی ئەسپاردەیە بە خاوەنەکەی بە تەواوی. کەوتنی ددان پێشوو مردنی باب و داکە هی سەری بەلام هی خواری مردنی براو خوشکە. کەوتنی خرێنە مردنی خزمی نزیکە: هێشانی ددان سکالایە لە دەست کردەوەی ناشیرینی خزمەکانی: کێشانی ددان هێشاو رزگاری یە لە دەست پەژارەو غەم ددانی زێڕ کردن ژیانی شادی یە هی سەدەف تەمەن کورتی یە. تیژبو ئەستووری ددان گەیشتنە بە ئاوات بە ئاسانی:

دۆ:

خواردنەوەی دۆ لە خەودا حەسانەوەیە لە ماندوو بوونی کاروباری ژیان بە کوری خۆیەوە:

دۆ دان:

دروست کردن و بە دەست کەوتنی ئەگەر پاک و جوان بوو ئەوە رزقی حەڵاڵە بەلام ئەگەر ورشک و ناشیرین بوو ئەوە دەردە تووشی ئازەڵ دەبێ.

داندۆک: دوێنە:

خواردنی لە خەودا دروست کردنی ساڵێکی تەڕو بە دەرامەتە بە هۆی بارانبارین

دەریا:

دیتنی دەریا لە خەودا بە ئارامیو بە ڕووناکی هاتنی پاشایێکی دادپەروەرە بۆ سەرکار یان عالمێکی سوود بەخشە. بەڵام دەریای لیڵو بە شەپۆل پاشای زۆردارە: لیڵو بێشەپۆل عالمێکی بێ سوودە بۆ کۆمەڵ. کەسێ لای وابوو ئاوی ساردی خواردەوە لە دەریا ئەویان خۆی یان خزمێکی دەبێتە خوێندەوار بەڵام ئاوی گەرم خواردنەوە لە دەریا تووش بوونی دەردوو بەڵایە کەسێک لای وابوو ئاوی دەریای هەموو خواردەوە ئەوە دەبێتە پاشا ئەگەر بشێ دەنا دەبێتە بازرگانێکی دەوڵەمەند: کەوتنە دەریاو هاتنە دەر زاڵ بوونە بە سەر کۆسپی ناهەمواری ژیاندا دیتنی دەریا بە شەپۆلاوی زۆر بوونی گوناحە لە لایان خەڵک. بڵاو بوونەوەی ئاوی دەریا بە سەر زەویدا زۆرداری کردنی پاشای وڵاتە لە خەڵک مەلە کردن لە دەریادا بەدەست کەوتنی پلەی بەرزە. کەوتنە ناو دەریا وون بوون لە ناویا مردنە بە شەهیدی. پەڕینەوە لە دەریا ڕزگاری لە دەردوو غەم. دیتنی دەریای خوێن. پەیدا بوونی شەڕوو کوشتارە لە دونیادا دەریای مەندوو ئارام[redacted]یە بۆ خەڵک[redacted]

دیــاری:

ناردنی دیاری بۆ یەکتری پەیدا بوونی خۆشەویستی‌یە لە نێوان یەکتری‌دا.

دۆمەلان:

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵی دونیایە بە ئاسانی. زۆر بوونی دۆمەلان لە هەرنمێک زۆربوونی خێرو خۆشی‌یە:

دووزمانی کردن:

دووزمانی کردن لە نێوان خەڵکدا لە خەودا گرتنی ڕێبازی دژی ئایینە.

داس:

دەست کەوتنی داس و دروونە پێ کردنە ئەگەر کاتی دروونە نەبێت ئەوە دەست کەوتنی خێرەو شکانی داس و کۆڵ بوونی. تووش بوونی کشت و کاڵە بۆ نەخۆشی و بێ دەرامەتی.

دەهۆڵ تەپڵ:

کەسێک لای وابوو لە هەرێمی دەهۆڵ و زوڕناڵێدە درا ئەوە خەڵکی هەرێمەکە تووشی غەم دەبێت بەڵام لێدانی دەهۆڵ بە تەنیا هەر وەکوو لێدانی دەفە.

دەنکە هەنار برمان:

خواردنی لە خەودا پەیدا بوونی نەخۆشی یە و بەدەست کەوتنی ڕزقی حەڵاڵە.

دوونگی مەڕ:

خواردنی بەدەست کەوتنی لە خەودا فێر بوونی زانیاری بەسوودە

دانیشتن: ڕوونیشتن:

کەسێ لای وابوو لە خەویا دانیشتبوو بە شادی ئەوە دەگاتە ئاواتی خۆی بە ئاسانی.

**دۆشاو:**

خواردنی دۆشاو: دینداری‌یه. کردنی دۆشاو ئامۆژگاری کردنه به چاکه بۆ ماڵو منداڵی:

**داڵغه:**

داڵغه لێدان له خه‌ودا به‌ڵێن نه‌بردنه سه‌ره.

**ده‌له‌ک:**

خواردنی گۆشتی له خه‌ودا بۆ نه‌خۆش شیفایه بۆ له‌ش ساغ ده‌ست که‌وتنی ماڵی دونیایه له به‌ر کردنی پێستی ده‌ڵه‌ک به ده‌ست که‌وتنی پایه‌ی به‌رزه. کوشتنه‌وه‌ی ته‌لاقدانی ژنه‌که‌یه‌تی:

**دوو دڵی:**

دوو دڵی کردن له کارێکدا بێ هێزی بڕوای موسوڵمانه.

**ده‌سماڵ: مێزه‌ر:**

له سه‌ر نانی مێزه‌ری سپی زۆر کردنی دینداری‌یه: هی زه‌رد نه‌خۆشی‌یه: هی ڕه‌ش: به‌رزی‌یه: هی سوور ژیانی شادی‌یه:

**ده‌نگ:**

ده‌نگی به‌رزو خۆش له خه‌ودا بیستنی یان وتنی ژیانی شادی‌و کامه‌رانی‌یه: ده‌نگی نزم‌و خنکاو تووش بوونی خاوه‌نه‌که‌یه‌تی به هه‌ژاری ته‌ڕاندن به ده‌نگی به‌رز به سه‌ر مه‌لادا مردنی بێ‌ئیمانی‌یه ده‌نگی بزن

قسەی ژنە کەیەتی. دەنگی مەڕ بیستنی خێرو بەرەکەتە دەنگی ئەسپ پەیدا بوون غەزایەو هەروەها دەست کەوتنی دیاری‌یە کە لە لایان پیاوێ گەورە دەستی دەکەوێ بیستنی دەنگی هێستر جێ‌بەجێ بوونی کاری زەحمەتە هەروەها منداڵ مردنە دەنگی کەر گران بوونی نرخی دانەوێڵەیە.

دەنگی مێشوولە بڵاو بوونەوەی ناداری‌یە دەنگی پشیلە بیستنی لە خەودا دروزمانی کردنە لە ناو خەڵکدا لە لایان ئەوەی دەنگەکەی بیستووە دەنگی زەردەواڵەو مێش هەنگوین بەڵێنی بەدرۆیە بە برادەران.. دەنگی گورگ ترسانە لە دووژمن هی مامرمارە کردنی کچێکی جوانە.. بیستنی دەنگی بەراز سەرکەوتنە بە سەر دووژمندا دەنگی سەگ فێڵ کردنە لە خەڵک دەنگی چەقەڵو رێوی هاواری هەژارانە لە دەست زۆرداران بیستنی دەنگی کۆتر دەنگی ژنێکی قورئان خوێنە دەنگی کەو ئاشکرا بوونی دزە دەنگی ژن کە خۆشبی ژیانی شادی‌یە.

دڵداری: مێ‌بازی: حەز لێ کردن:

کردنی دڵداری لە خەودا نەویستنی ماڵو منداڵی خۆیەتی کە هەی بێ ئەگەر نەی بێ ئەوە کردنی کاری ناڕەوایە کە سووکی ناو کۆمەڵ دەبێ ئەگەر کچێ بە کوڕێکی ووت من دڵداری تۆمە ئەوە دەیەوێت فێڵ لەو کوڕە بکات دڵداری لە گەڵ کوڕ بە خاوێنی ئەنجامی خواپەرستنە بەڕاستی بەڵام بە کرداری پیسەوە لادانە لە فەرمانی خوای گەورە.

دوڕ:

بەدەست کەوتنی دوڕی جوان پایەی بەرزە بەڵام هی ژەنگن. تەڵاقدانی ژنە کەیەتی.

دیـــوار:

راوەستان لە سەر دیوار بەهێزییە لە ماڵی دونیاوە. چاک کـردنەوەی دیواری کۆنو رووخاو ئامۆژگاری کردنی خەڵکە بۆ کردنی کرداری جوان خۆ دیتن لە ناو دیواردا مردنی نزیکە کردنی دیواری قـــڵو گـێچ تـووش بوونی غەمو دەردە بەڵام دیواری قورِ دینداریـیە هـی چـەمەتۆ دەست کەوتنی پایەی بەرزە. خواری دیوار لادانی خاوەنەکەیەتی لە فەرمانی خوا: رووخانی دیوار بۆ ناو خانوو مردنی خاوەن دیوارەکەیە بە سـەر خۆیدا کە بڕووخێ ئەوە کردنی گوناحی زۆرە. سواقدانی دیوار: بـەقورِ باشە: گـێچ غەمە: رەنگ کردنی دیوار بە هـەر رەنگـی هـەبێ لادانـە لە فـەرموودەی شـەریعەتی ئیـــسلام.

دزی کردن:

کەسێکی نەخۆش لە خەویا لای وابوو دزی لێ کرا ئەوە دەمرێ. دزی کردنو خۆ شـاردنەوە زینا کردنە ئەگەر لای وابوو دز هاتە ماڵیو ویـــتی دزی بکـــات ئـــەوە داخـــوازی کـچی یـان خـوشـکی لێ دەکـەن: گـرتنی چاکبوونەوەی نەخۆشـە لە دەردەکەی ئەگەر نەخۆشـەکە دزی گـرتولێ نەگەرا دزی بکات:

دێوانە:

کەسێ لای وابوو بووتە دێوانە ئەوە ئەگەر دیـوانـەی تـەریـقەت بـێ دەگاتە پلەی بەرزی ئایین. بەڵام دیوانەی دونـیا ئـەوە کـەسێکی درۆزنو ریابازە:

درندە:

خۆماڵی کردنی هەر درەندەیێکی و یان لە ناودانی ئامۆژگاری کردنی زۆرداره بۆ نەکردنی زۆرداری لە هەژاران. خواردنی گۆشتی درندە غەیبەت کردنی پاشای وڵاتە.

دەست نوێژ:

هەڵ گرتنی دەست نوێژ لە خەودا بە ئاوی پاک گرتنی ڕیبازی پێغەمبەرە بەڵام بە ئاوی پیس یان گەرم. یا بە بەفر یا بە شەختە تووش بوونی غەم و دەردە:

دەرگا: دەرک:

کەسێ لای وابرو دەرگەی ماڵی جوانە ئەوە شادییە لە لایان گوێ ڕایێلی ژنەکەی. بەڵام دەرگەی ناشیرین تووش بوونی غەمە بەهۆی ژنێکی هەڵەوەر کەسێ لای وابرو دەرگەی کردەوە ئەوە ئەو مەبەستەی کە هەیەتی بە ئاسانی جێبەجێ دەبێ گرتنی دەرگەی خانوو تووش بوونی خاوەن خانووەکەیە بۆ ئازاوە بەهۆێ ماڵ و منداڵی نالەبار ئەگەر کەسێ لای وابرو خەریکی گرتنی دەرگەیە لە ماڵی بەڵام بۆی نەگیرا ئەوە ئامۆژگاری ژنە چەناو سروەکەی دەکات و سوودی نیە کەسێ لای وابرو دەرگەی ماڵی ئاسنە ئەوە پایەی بەرزی دەست دەکەوێ:

دەوڵەمەندی:

دەوڵەمەندی بەهۆی کردنی شتی حەڵاڵ شادییە. بەڵام بەهۆی شتی حەرام ژیانی دەردەسەرییە.

دارچین:

خواردنی له خەودا به مێردداني كچی یان خوشكیتی نابەدڵ:

دەرزی:

بەدەست كەوتنی دەرزی تیژوو جوان له خەودا ژیانی خۆشی خۆیو ماڵو منداڵی‌یه ئەگەر لای وابوو دەرزی له بەدەنی كەسێك ڕوو دەكات ئەوه غەیبەتی ئەو كەسه دەكات قوت دانی دەرزی بڵاو كردنەوەی نهێنی خۆیەتی كه زیانی هەیه كۆل بوونو شكانی دەرزی تێك چوونی ژیانی خۆیو ماڵو منداڵی‌یه بەدەست كەوتنی دەرزی زێڕ بۆ كچ مێرد كردنی به دڵ خوشی‌یه بەڵام بۆ كوڕ ژن هێنانی نابەدڵه بزر بوونی دەرزی ڕاوەستانی كاروباری خاوەنەكەیەتی بەهۆی كەسێك كه به دزی دژی ئەوەو كابراش ئەمه نازانی.

داڵەش: هەڵو: دووبرا:

كوشتنی له خەودا زاڵ بوونه بـه سـەر دووژمـندا خـواردنی گـۆشتی دەست كەوتنی ماڵی حەرامه بەهوی پاشای وولات:

زۆربوونی هەڵو له وولاتی پەیدا بوونی كاربەدەستانی پاشای زۆرداره كه خەڵك ئازار دەدەن:

داركۆڵینه:

گرتنوو دیتنی له خەودا ماندوو بوونه بۆ ژیانداری خواردنی گۆشتی ژن هێنانی نابەدڵه.

دامە:

کردنی دامە لە خەودا تەمەن بەفیڕۆدانە لە شتی بێسوود کردنی دامە لە سەر قومار خەبانەت کردنە بە ژنی جیران دۆڕاندنی دامە لە خەودا تووشبی بوونی ڕقە بەری‌یە لە گەڵ کاربەدەستانی میری.

دانکە:

کەسێ لای وابوو لە ناو ئاژەڵ دانکە هەیە ئەوە خەڵکی هەرێمەکە نوێژ ناکەن تۆبە بکەن باشە.

دم: کەپوو: لووت:

جوانی لووت لە خەودا ژیانی بەختیاری‌یە هێشانو ناشیرینی تووش بوونی غەمە: دمی ئاسن‌یان زێڕ تووش بوونی دەردوو بەڵایە... بڕینی لووت کردنی کاری بێ ئابڕوانەیە لە ناو کۆمەڵ زۆربوونی لووت لە دەمو چاودا ژیانی خۆشە: کەسێ لای وابوو دوو لوتی هەیە ئەوە ئەو دوو کوڕی دەبێ. ئەگەر لای وابوو لووتی نیە ئەوە زۆر بێ‌ڕەحمو بەزەیی‌یە بەرانبەر بە هەژاران:

دەرپێ:

بنوارە شەروار:

دەستەندوو:

کەسێک لای وابوو دەستەندوی جووت کردنی بە دەستەوەیە ئەوە حەج دەکات لە خەودا لە دەست چوونی درامەتی شینا ووردی بەهۆی ئاگر.

دەسرازە: بەستە:

ژنێکی لە خەویا لای وابوو بە دەسرازە لە ناو لانک منداڵەکەی خۆی بەستەوە. ئەوە ئەو مەبەستەی هەیەتی بوی جی بە جی نابی

دەستە وانە:

کە سێک لای وا بو دەستە وانەای کردە دەست ئەوە پیاوەیکی ئاینیٚ یارمەتی دەدات بۆ جێ بەجێ کردنی ئاواتەکەی وسەردەکەوێ

دەست بە سەراگرتن:

دەست بە سەراگرتنی هەر شێک لە خەوا هەرکەسی هەبێت لادانە لە فەرمانی قورانی پیرۆز:

دژوینی دایک: چڵکن بونی دایک

کەسێ لای وابرو دژوێنو چڵکە ئەوە لادانە لە فەرمودەی خوا دیتنی بە شادیەبە. کەسێ لای وابرو جیماعی لەگەڵ دایکی خۆی کرد ئەگەر دایکی مردبو ئەوە خێری بۆ دەکات ئەگەر ناخزمەتی دەکات مردنی دایک مردنی ژنە.

# « پیتی ڕێ »

ڕۆژی گرتن:

کەسێک لای وابوو لە مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژووە ئەوە مژدەیە بەوە کە خوا عەفوی کردووە لە گوناحان: هەروەها ڕۆژی گرتن بە غەیری ڕۆژ جەژنەکان لە خەودا ڕیازگرتنی دیندارانە.

ڕکوع: چەمینەوە:

کەسێک لای وابوو لە نوێژدا ڕکوعی برد بە تەواوی ئەوە بەختیاری دین و دونیایە بەڵام ڕکوعی ناتەواو زەکات نەدانی ماڵە ئەگەر ژنێک لای وابوو ڕکوعی برد ئەوە تۆبە دەکات لە ئازاردانی مێردی.

ڕووناکی:

کەسێک لای وابوو لە تاریکی هاتە ڕووناکی ئەوە لە ژیانی ناڵەبار دەکەوێتە خۆشی. دیتنی ڕووناکی زۆر دینداری‌یە. لە بەر کردنی جلکی ڕووناک حەج کردن و چاکە کردنە. کەسێک لای وابوو بەدەنی ڕووناکی دەدات ئەوە کوڕێکی دەبێ درەای باشی بۆ دەکات.

ڕم:

بەدەستەوە گرتنی ڕمی درێژ لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزە ڕمی زێڕ موژدەی خۆشە. ڕمی زیو کوڕ پەیدا بوونە ڕمی مس و داروو ئاسن دەست کەوتنی ڕزقی حەڵاڵە کورت بوون و شکانی ڕم لە دەست چوونی پایەیە بەهۆی زۆرداری کردن لە هەژاران.

ڕەنگ:

دیتنی ڕەنگی زەرد نەخۆشی‌یە هی ڕەش غەمە هی سوور تووش بوونی شەڕە. هی سپی شادی‌یە. هی سەوز شەهید بوونە.

ڕووبار:

دیتنی ڕووباری ڕووناک لە هەرێمێک ژیانی شادی‌یە بۆ خەڵکی هەرێمەکە بەڵام ڕووباری قوڕاوو بۆ گەن ژیانی ناخۆشە بۆ خەڵکەکە پەڕینەوە لە ڕووبار ڕزگاری‌یە لە غەم دیتنی ڕووباری خوێن لە هەرێمێک تووش بوونی خەڵکی هەرێمە بە کوشتارو شەڕ پەیدا بوونی ڕووباری زۆر لە شارو دیهات دادی پاشای وڵاتە.

ڕوو خۆشی:

کەسێک لە خەودا ڕووخۆش بوو ئەوە دڵی لەگەڵ خەڵک پاکە.



ڕاست گۆیی:

ڕاست گۆیی لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزوو ڕزگاری‌یە لە هەموو مەترسی‌یەک.

ڕەژوو: خەڵوز:

بارینی ڕەژوو لە ئاسمان گرانی شتی کشت و کاڵە: گەشاندنەوەی ڕەژوو لە خەودا ڕقەبەری‌یە لە گەڵ ڕژێمی پاشای وولات درووست کردنی ڕەژوو فێر کردنی هەندێ دانیشتووانە بۆ.. پێنەسازی لە لایان ڕەژوو کەرە کەوە: خواردنی ڕەژوو تووش بوونی غەمی زۆرە لە لایەن خزم و کەسی خۆی.

ڕێوی:

گرتنی ڕێوی مارە کردنی ژنێکە کە ڕەسەنە بەڵام گرتنی بە تەڵە مارە کردنی ژنە بە درۆوو دەڵەسە: یاری کردن لە گەڵ ڕێوی دڵداری‌یە لە گەڵ ژنێکی فێڵباز خواردنی گۆشتی ڕێوی تووش بوونی دەردە لە بەر کردنی کەوڵی ڕێوی بەدەست کەوتنی پلەی بەرزە لە ناو کۆمەڵ:

ڕیخ: شیاکە: تەرس:

کەسێک لای وابوو بەدەنی‌یان جلکی بەڕیخ بووە ئەوە لە لای پاشای وولات ماڵی زۆری دەست دەکەوێ بەهۆی زانیاری‌یەوە ئیش کردن لە ناو ڕیخ دەوڵەمەندی‌یە خواردنی ڕیخ وەرگرتنی پارەیە بەڕیبا لە دەوڵەمەند:

ڕۆیشتن:

کەسێک لە خەودا بەدەعیە بڕوات ئەوە پایەی بەرزی دەست دەکەوێ بەڵام زوو دادەبەزێ.

ڕوو سپی بوون:

کەسێک لە خەودا ڕووی سپی بوو ئەوە تووشی دەرد دەبێ بەڵام بە

ئەندازە ڕوو سپی بوون بەدەست کەوتنی شەرەفی دونیایە.

ڕێ خۆش کردن:

ڕێ خۆش کردن لە خەودا بە هەر جۆری هەبێ بە دوورا کەوتنی فەرموودەی پێغەمبەرە(د.خ).

ڕوو: دەم‌وچاو:

جوانی‌و زیاد بوونی ڕوو لە خەودا بەرزی‌یە لە پلەدا ناشیرین‌و کەم بوونی بێ‌هێزی‌یە. داپۆشینی ڕوو قەردار بوونی زۆرە بەڵام داپۆشینی بۆ ژن لە خەوداکردنی ڕەووشتی جوانە:

ڕان:

جوانی‌و ئەستوری. دەستەڵاتی خزم‌و کەسێتی باریک بوونی بێ هێزی کەسور کارتی کەسێ لای وابوو پارچە گۆشتێکی زیادی بەڕانەوە هەیە ئەوە کەسێک بەدرۆ خۆی دەکاتە کوڕی ئەوو بەڵام هەوینە:

ڕشانەوە:

کەسێک لای وابوو بەڕۆژوووەو ڕشایەوە ئەوە قەردی خەڵکی لایەو نایداتەوە. ئەگەر ڕشایەو نار قاپ ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان ئەگەر لای وابوو ڕشانەوەکەی تام‌و بۆنی خۆشە بە کەیفی خۆی ڕێی چاکە دەگرێ بەڵام ئەگەر ناخۆش بوو ئەوە لە ترسان چاکە دەکات.. کەسێ لای وابوو بەڵغەم ڕشایەوە ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبێ بەڵام ئەگەر خوێن ڕشایەوە ئەوە ئەسپاردەی خەڵک دەداتەوە کەسێ لای وابوو ڕشانەوەی خۆی خواردەوە

ئەوە فەرمانی خوا جیٰ‌بەجیٰ دەکات.

رشک:

خواردنی لە خەودا ژنٰ هێنانی نابەدڵە هەبوونی رشک لە سەر بەدەنو جلک گوناح کردنە شوشتنی جلکو بەدەنٰ لە بەر رشک تۆبە کردنە لە کرداری دژی ئاینی ئیسلام.

رازایانە:

خواردنی لە خەودا ئەمین بوونە لە فێڵی دووژمنان چاندنی بەدەست کەوتنی هێزە بەهۆیٰ پاشای وڵات.

رەش ویلە:

گرتنی لە خەودا برادەرایەتی کەسێکی کەم دینە زۆربوونی لە هەرنمێک.. پەیدا بوونی پیاوانی خواپەرستە لەو هەرێمە. گۆشت خواردنی بە دواگەرانی مێ‌بازی‌یە. کوشتنەوەی لە خەودا کردنی کارێکە کە ئابرووی دەبات.

رەقێتە:

دەرکردنی لە خەودا لە سەر بەدەن نەکردنی نوێژە.

رزیو:

خواردنی شتی رزیو لە خەودا دوور دڵی‌یە بەرانبەر خوای گەورە..

ڕۆژ: خۆر:

گرتنی ڕۆژ له خەودا دەست کەوتنی شەرەفە. هەلآتنی بە ڕووناکی ئەگەر پاشا دیتی ئەو دەستەڵاتی خۆیەتی: مەلا دیتی عیلمی زۆرە بۆ بازرگان سوودی زۆرە بۆ کچ میردی باشە بۆ کوڕ ژنی باشە بۆ غەمبار شادی‌یە بۆ حەپس ڕزگاری‌یە بۆ دیندار زیاد کردنی دینداری‌یە بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یە. هەلآتنی ڕۆژ بەسووری کوشتنی پاشایە گیرانی ڕۆژ لاچوونی پاشایە هەلآتنی بە تاریکی بێ‌هێزی پاشایە کەوتنی بە سەر زەویدا مردنی پاشایە. ڕۆیشتن لەگەڵ ڕۆژ مردنە: قسە کردنی ڕۆژ لەگەڵ کەسێک دەست کەوتنی پایەی بەرزە دەوڵەت بوونی ڕۆژ یاخی بوونی کەسێکە لە پاشاکە سەردەکەوێ. هەلآتنی لە ڕۆژئاوا پەیدا بوونی کاری ناشیرینە لە ناو خەڵک پەیدا بوونی زۆر ڕۆژ لە ئاسمان پەیدا بوونی شتی دژی دینەو گرانی نرخی خواردەمەنی‌یە سوجدە بردنی ڕۆژ لادانە لە فەرمانی خوا کەوتنی ڕۆژ بۆ ناو ماڵێک پەیدا بوونی کەسێکی عالمە لەو ماڵە هەلآتنی ڕۆژو گەڕانەوەی لاچوونی پاشایە.

---

ڕاو:

کردنی ڕاو لە خەودا بە دواکەوتنی شتی بێ‌سوودە. ئەگەر لای وابوو بە تفەنگ یان بە تیر نێچیری کوشت ئەوە بەهۆی کەسێکەوە دەگاتە ئاواتی خۆی.

ڕەمڵ:

بنوارە زیج.

ڕێگا:

ڕۆیشتن بە ڕێگای ڕاستدا جێ‌بەجێ کردنی فەرمانی خوایە بەڵام بە

ڕەنگای جیاجیاو نالەبار لادانە لە فەرمانی خوا. كەسێ لای وابوو ڕەنگەی لێ گۆڕاوە یان وونبووە ئەوە بە دژی ئایینی ئیسلام قسە دەكات ئەگەر لای وابوو ڕەنگە پێشانی خەڵک دەدات ئەوە فەرمان بە چاكە دەكا ئەگەر لای وابوو پاشای وڵات ڕەنگەو بان دەكاتەوە ئەوە دادپەروەری بڵاو دەكاتەوە:

ڕدێن: ڕیش:

درێژ بوونی ڕیش لە خەودا دینداری‌یە. بەڵام كورتی هەژاری‌یە. منداڵ ئەگەر ڕدینی هەبوو لە خەودا ئەوە دەمرێ. ڕدین بۆ ژن لە خەودا تووش بوونی بەڵایە ڕدێنی ڕەش خۆشی و ماڵداری‌یە ڕدێنی سپی نزیک بوونەوەی مردنە ڕدێنی زەرد تووش بوونی دەردو بەڵایە تراشین لە خەودا سەرف كردنی ماڵە لە شتی بێ‌سوود كەسێ لای وابوو بە ڕدێنی ڕای دەكێشن ئەوە میراتی خزمێكی دەست دەكەوێ هەڵقەندنی موو لە ڕدێن لە دەست چوونی ماڵی دونیایە:

ڕیخۆڵە: ڕێولە:

هێشانی لە خەودا تووش بوونی دەست كورتی‌یە لە ماڵی دونیاوە... درانی خواردنی شیربایی‌یە خواردنی ڕیخۆڵەی حەیوانی حەڵاڵ دەوڵەمەندی‌یە:

ڕیس:

كەوتنە دەستی ڕیسی جوان گەیشتنە بە ئاوات بەڵام بە زەحمەت.. بوونەوەی ڕیس بە خوری‌و مەرزو لزكە لە دەست كاتە بۆ خەبات كردن بۆ ئەو مەبەستەی كە هەیەتی.

**ڕاونان: بەدواکەوتن: لە دواغاردان: سەرلەدناوە:**

کەسێک لای وابوو ڕاوی ژن دەنێ ئەوە بە دواکەوتنی دونیایەو نایگاتێ ئەگەر لای وابوو ڕاوی کەسێک دەنی یان یەکێک ڕاوی ئەو دەنی ئەو هەردووکیان تووشی غەم دەبن.

**ڕووناکی:**

کەسێ لای وابوو شەو نەماوو ڕۆژهەڵات و ڕووناکی داهات ئەوە لەو خەمەی هەیەتی ڕزگاری دەبێ.

# « پیتی ز »

زەلزەلە: بومەلەرزە:

لە پیتی بێ بە کورتی باسمان کرد بەڵام لێرەدا بە گوێرەی کات بە درێژی باسی دەکەین هاتنی لە مانگی ئایار پەیدا بوونی شەڕوو کوشتارە. لە حوزیراندا لە ناو چوونی دزوو جەردەیە لە تەمرزدا مردنی پیاوێکی ناودارە لە ئابدا هاتنی پاشایێکی زۆردارە لە ئەیلولدا هاتنی خەڵکی بێگانەیە بۆ هەرێمی بومەلەرزە لە تەشرینی یەکەمدا پیدا بوونی نەخۆشی یە لە تەشرینی دووەمدا مردنی بەزۆری ژنی ئاووسە لە کانوونی یەکەمدا گران بوونی نرخی خواردەمەنی یە لە کانوونی دووەمدا مردنی زۆری گەنجانە لە شوباتدا پەیدا بوونی نەخۆشی گرانی تایە لە مانگی ئاداردا هەرزان بوونی شتی پێ ویستە:

زیوان:

خواردنی و بەدەست کەوتنی دەرزوزە کردنە لە کەسێکی ناپەسەن

زریشک:

خواردنی و بەدەست کەوتنی دەرزوزە کردنە لە کەسێکی ناپەسەن چاکە کردنە لە گەڵ کەسێکی سپڵەو بێ ئەمەک:

زەمزەم:

خواردنەوەی ئاوی زەمزەم تۆبە کردنە لە گوناحان. خۆ شـوشتن بـە ئاوی زەمزەم حەج کردنە بە ماڵی حەلاڵ ئاوی زەمزەم بە جلک داکـردن مردنی خاوەنەکەیەتی.

زەبور:

خوێندنی لە خەودا تۆبە کردنە لە گوناحان گرتنی ڕێبازی دیانەتە.

زەکات:

زەکات دان لە خەودا جێبەجێ کردنی فەرمانی خوایە بە دڵسـۆزی

زەکەریا پێغەمبەر:

بـە خـزمەت گـەیشتنی لە خـەودا پـەیدا بـوونی کـوڕێکی باش و خوێندەوارە.

زیارەتی گۆڕی مردوو:

لە خەودا زیارتی گۆڕی پیاو چاکان بەدەست کەوتنی شادییە هەروەها بڕوای تەواوە بە خوا.

زوهرە:

دیتنی ئەستێرەی زوهرە خواستنی ژنە یان بۆ خۆی یان بۆ خـزمێکی گرتنی ئەستێرەی زوهرە برختانی پێ دەکرێ کە دوورە لەو برختانە.

زەیتون:

خواردنی زەیتون لە خەودا دڵ نەرمی یە خێر کردن هەروەها.. دەوڵەمەندی یە کەسێ لای وابوو ڕوونی زەیتونی لە ناو زەیتون دەکردەوە ئەوە بە نەزانین دایکی خوی مارە کردووە. چاندنی زەیتون دەرسی قورآنی پیرۆزە کە بە خەڵک دەڵێت بە دەستەوە گرتنی گەڵای زەیتون دینداری یە بە زۆری.

زەعفەران:

دیتنی لە خەودا خەڵک بە چاکە باسی دەکات زەرد کردنی بەدەن و جلک بە زەعفەران تووش بوونی دەردە کوتانی زەعفەران کردنی ئێشێکە کە غەم و خەفەتی هەیە:

زمرووت:

بەدەست کەوتنی بە جوانی ماڵ و منداڵی گوێ ڕایەڵو باشە.

زەنبیلە:

دروست کردنی زەنبیلە لە خەودا گرتنی ڕێگەی خراپەرستنە.

زەنجەفیل:

خواردنی لە خەودا بۆ نەخۆش مردنە بۆ لەش ساغ بەدەست کەوتنی ماڵی دونیایە.

زوبەرجەد:

بەدەست کەوتنی لە خەودا مردنە بە شەهیدی.

زەوی: زەملن: عارد:

کەسێک لای وابوو لە سەر زەوی جوان دانیشتووە ئەوە ژنی جوان مارە دەکات خواردنی زەوی سوود وەرگرتنە لە کشتو کاڵ کەسێ لای وابوو زەوی قوتیدا ئەوە سەفەرێکی درێژ دەکات شەق بوونی زەوی لە هەرێمێک گوناحباری خەڵکەکەیە کەسێ لای وابوو بوو بە زەوی ئەوە پایەی بەرز دەبێ کەسێ لای وابوو زەوی خەڵک قوت دەدات ئەوە لایان داوە لە فەرمانی خوا کەسێ لای وابوو بەدەست لە زەوی دەدات ئەوە سەفەری بازرگانی دەکات وە سوودی دەست دەکەوێ کەسێ لای وابوو لە زەوی شۆرەکات تۆو دەوەشێنی ئەوە ژنەکەی نەزۆکە فرۆشتنی زەوی بۆنە خۆش مردنە بۆ لەش ساغ هەژارییە کەسێ لای وابوو زەوی پێچرایەوە ئەوە مردن زۆر دەبێ کەسێ لای وابوو گەنجێک لە زەوی هاتە دەرێ ئەوە بەڵایە بۆ خەڵکی هەرێمەکە بەڵام ئەگەر پیری لێ هاتە دەرێ ئەوە دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیان ئەگەر دڕەندەی لێ هاتە دەرێ ئەوە پاشایێکی زۆردار دێتە سەر حوکمو زۆرداری دەکات.

زار: دەم: دەو:

بەستنی زار لە خەودا کافر بوونە. بۆگەن بوونی زار غەیبەت کردنە گەورە بوونی زار دەوڵەمەندییە بەڵام بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە.

زمان: زوبان:

ڕەش بوونی زمان بەدەست کەوتنی پایەی بەرزە درێژبوونی دەسەڵاتە بۆ خاوەنەکەی زمان بە مەڵاشوورە نووسان شاردنەوەی شاهیدییە زمان بڕین زاڵ بوونی ناحەزە بە سەر زمان بڕاودا لاڵ بوونی زمان لادانە لە

فەرمانی خووا بڕینی زمانی هەزارێک لە خەودا خێر کردنە بە هەژارەکە. کەسێ لای وابوو دروزمانی هەیە ئەوە زانینی زۆر دەبێ کەسێ لای وابوو مووی سپی لە سەر زمانی پەیدا بوو ئەوە بە درەنگی تووشی بەڵا دەبێ بەڵام مووی ڕەش بە زوویی توش دەبێ زۆری زمان پەیدا بوونی منداڵی زۆرە نەبوونی زمان مردنی منداڵە گەستنی زمان ڕق فوت دانەوەیە دەوڵەت بوونی زمان درۆ کردنە تەماشا کردنی زمان پاراستنی زمانە لە قسەی خەراپ.

زگ: سگ: وورگ:

گەورە بوونی زگ لە خەودا پەیدا بوونی منداڵی باشە بەڵام بچووک بوونی توش بوونی غەمە لە سەر زگ ڕژیشتنی پشت بەستنە بە ماڵی دونیا ئاگر پەیدا بوون لە ناو زگ خواردنی ماڵی هەتیوە بریندار بوونی زگ نەخۆشی بوونی خاوەن و مردنی منداڵی‌یە جوانی زگ دەوڵەمەندی‌یە بێ هێزی زگ هەژاری‌یە هێشانی پەیدا بوون لە ناو زگ زیاد بوونی دونیایە. دڕانی زگ تەماع کردنە بۆ ماڵی دراوسێ.

زرێ:

پۆشینی زرێ لە خەودا سەرکەوتنی بە سەر کوسپی ژیاندا پانی زرێ کەم بوونی ماڵ دەستەڵاتە.

زێڕنیگەر:

دیتنی لە خەودا بردەرایەتی کەسێکە جیاوازی چاکەو خەراپە ناکات. کەسێ لای وابوو بوو بە زێڕنگەر ئەوە ژنێ بەفێڵ مارە دەکات کە ئەنجامی تووشی دەردەسەری دەبێ.

زیخ: ڕەمڵ:

کۆکردنەوەی لە خەودا ماڵ کۆکردنەوەیە بۆ ژن هێنان بەڵام ماڵەکەشی لێدە دزرێت. دانیشتن لە ناو ڕەمڵ بۆ پیاو پاشەکەوت کردنی ماڵە... بەڵام بۆ پیرەژن تۆبە کردنە لە گوناحان ڕەملی زەرد لە خەودا دیتنی خێر کردنە بە هەزاران بەڵام هی سپی دەستی لە دونیادا درێژ دەبێ بە دەستەڵات دەبێ بەڵام ئەم دەست درێژیەی زیان بە قەیامەتی دەدات.

زینار:

بەستنی لە خەودا لە پشت. لادانە لە فەرموودەی پێغەمبەری ئیسلام د.خ.

زینا کردن:

کردنی زینا لە خەودا گوناحێکی گەورەیە ئەگەر ژنێک داوای زینا کردنی لە کەسێک کرد ئەو کەسە ماڵی حەرام دەخوات کەسێ لای وابوو زینای لەگەل کچێک کرد ئەوە بارە لە جێگایێکی توروند دادەنێ: کەسێک لای وابوو حەددی زینایان لێدا ئەوە پایەی بەرز دەبێ کەسێ لای وابوو لەگەڵ چوونە لای ژنێک زینای لەگەڵ بکەن ئەوە چوونی لای عالمێکە کە زانیاری لێ فێر دەبێ لە دەربارەی ئاینەوە چوونی قەحبەخانەو هاتنە دەری. مردنی زووە کەسێ لای وابوو کەسێک لەگەڵ ژنی کەسێکی درێژ بوو وە خاوەنی ژنەکەش ئاگای لێ بوو دەنگی نەکرد ئەوە کابرای درێژ بوو ئیشوو کاری خاوەن ژنەکە دەکات بە ئەمینی:

زنجیر: کۆت:

کەسێ لای وابوو دەستی بە زنجیر بەستراوون ئەوە زەکاتی ماڵ نادات

ئەگەر لای وابوو پێی بەستراوون ئەوە تەنبەڵی دەکات لە کاروباری خۆیدا کەسێ لای وابوو زنجیر لە ملی دایە ئەوە تۆبە دەکا لە گوناحان. پساندنی زنجیر لە دەست و پێدا لاچوونی غەم و دەردە.

زەنگە سوورە: زەردەواڵە:

زۆر بوونی زەردەواڵە لە هەر جێگایێک هاتنی عەسکەرێکی زۆردارە بۆ جێگاکە تێک چوونی شانەی زەردەواڵە نەمانی دەستەڵاتی پاشای زۆردارە. کوشتنی زەردەواڵە زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا..

زنج: کوخ:

درووست کردنی زنج ئیش کردنی بەردەوامەو بەسوودە: ڕووخانی زنج لە دەست چوونی دەرامەتی کشت و کاڵە بە هەر هۆیێ بێ.

زەرافە:

گرتنی لە خەودا ئەوە ژنێ بێهوش و سادە مارە دەکات. خواردنی گۆشتی مارە کردنی کچێکە بەڵام کچەکە نابەدڵ شووی پێ کردووە..

زێرو: زالو: هەزارپێ:

کەسی لای وابوو زێرو پێیەوەدا ئەوە لە لای دووژمنەوە زیانی پێ دەگا: هاتنە دەری زێرو لە زارو لە لوت و لە عەورەت پەیدا بوونی منداڵی ناتەواوە بۆ ژنی خەوەن بینەکە:

زیـــو:

دڵداری دەکات: تواندنەوەی زیو رقە بەری‌یە لە گەڵ ژنەکەی و بلاو دەبێتەوە لە بەر کردنی بەرگی زیو. تووش بوونی غەم و خەفەتە:

زراو: کیسەی زەرداو

هێنانی زراو لە خەودا لە دەست چوونی برادەری دڵسۆزە خواردنی مارە کردنی ژنی نابەدڵە: کە ئەنجامی ئاژاوەو نالەباری‌یە..

زوشک: دوپشک

کوشتنەوەی لە خەودا شکاندنی دڵی ژنی خۆیەتی بە بەلاش خواردنی گۆشتی زوشک غەمێکە بێ هۆیە: گرتنی لە خەودا دۆستایەتی کەسێکی ناڕەسەنە: کە زیانی لێ دەبینێ:

زیرە کردن:

زیرە کردن لە خەودا کردنی شتی ناڕەوایە زیرە کردنی منداڵ مردنی زۆرە بۆ پیاوان ڕوو دەدات:

زینی ئەسپ:

دەست کەوتنی لە خەودا مارە کردنی سێ ژنە: کەسێک لای وابوو لە سەر زینی ئەسپەکەی سەگ یان پشیلە سوار بوون ئەوە کەسێک خەیانەت بە ژنەکەی دەکات: شکانی و بزر بوونی زینی ئەسپ مردنی خاوەنەکەیە.

زاوا:

کەسێک لای وابوو بوو بە زاوای بووکێکی ناسراوی جوان ئەوە پایەی

بەرز دەبێ بەڵام بۆ بووکی نەناسراو مردنی زاواکەیە:

زێڕ:

لە خەودا بەکار هێنانو دەست کەوتنی زێڕ بۆ پیاو غەمو خەفەتە بەڵام بۆ ژن ژیانی شادی‌یە:

زبڵ خانە: گوفەک: سەران گوێ لک: زبڵ دان:

کەسێک لە خەودا لای وابوو لە سەر زبڵ خانە وەستاوە ئەگەر فەقیر بێ دەوڵەمەند دەبێ ئەگەر بێ‌ژن بێ ژن دەهێنێ ئەگەر غەمبار بێ غەمی نامێنی: ڕاوەستان بە ڕووتی لە سەر زبڵ دان نزیک بوونی مردنیتی.

سینەما:

چوونی سینەما لە خەودا هەڵ خەڵەتانە بەهۆی بەڵێنی کچێکی بەدرۆ.

سەرتاشخانە:

دیتنی سەرتاشخانە لە خەودا دیتنی دادگای میری‌یە ئەگەر لای وابوو چوو بۆ سەرتاشخانەو سەری تاشی ئەوە لە داوانێکی خۆی بەرانبەر بە یەکێک کە کردوویەتی سەردەکەوێ بەڵام ئەگەر سەری نەتاشی ئەوە بێ دەکەوێ دیتنی سەرتاش لە خەودا کەسێکە کە بە ئەنجامدانی ئیشی خەڵک هەڵدەستێ.

سەفەر:

کردنی سەفەر بۆ نەقیر دەوڵەمەندی‌یە بەڵام بۆ دەوڵەمەند کرینی شتی سواری‌یە وەک ماینو ترومبیلو ماتۆڕ.

سندم:

بنوارە زنجیر.

سەوزە:

خواردنی لە خەودا زۆر باشە بە تایبەتی بۆ کوڕو کچی عازەب گەیشتنە بە ئاوات.

سپڵ: فاتەڕەشە:

گەورە بوونی تووشی بوونی دەردە. خواردنی سەرف کردنی ماڵە بە بێ سوود هێنانی فاتەڕەشە لە خەودا لە دەست چوونی ماڵی دونیایە.

سێڵ: ساج:

بەدەست کەوتنی ساجی نان لە خەودا بۆ ژن مێردێکی باشە. بۆ پیاو ژنێکی کابانو ئارامە شکانو بزر بوونی یان مردنی منداڵە یان تەڵاقدانی ژنی خاوەن ساجە.

سوورکە: سووریژە:

پەیدا بوونی لە سەر بەدەنی منداڵ لە خەودا دوا ڕۆژێکی باشو ڕووناکە بۆ ژن تەڵاقدانە بەهۆی چەنە بازی بۆ پیاو لادانە لە فەرمانی پاشاکە بەم هۆیە دەکوژرێ.

سەهۆڵ:

کەسێک لای وابوو لە شێکدا سەهۆڵی کرد ئەوە تووشی ئازاوەی ماڵی خۆی دەبێ بەهۆی ژنی چەنە هەراش.

سلق:

خواردنی لە خەودا بە کاڵی کردنی ئیشیو کاری بێ ئابڕووانەیە. چاندنی لە خەودا چوونە لای ژنی خۆیەتی لە پشتەوە کە ناڕەوایە.

سەروو:

چانی داری سەروو قسە کردنی بێ عەمەلە بڕینی داری سەروو بەشوو دانی کچە یان خوشکە. بە دەستەوە گرتنی داری سەروو مارە کردنی کچێکی بەنازوو سادەیە.

سمۆره:

خواردنی گۆشتی قوت دانەوەی رقە بەرانبەر تاوانبار گرتنوو ڕام کردنی دلداری‌یە لە گەڵ ژنێکی حیلەباز. کەول کردنی سمۆره دەوڵەمەندی‌یە.

سعات کاتە ژمێر:

بەدەست کەوتنی سعاتی جوان سەرکەوتنە لە ژیاندا: وەستانی سعات مردنی خاوەنەکەیەتی سعاتی زێڕ دەست کەوتنی هێنانی ژنێکی زۆر بە ئەرکە.

سنەوبەر:

چوونی سەرداری سنەوبەر لە خەودا هاتنەوەی کەسێکی وون بووی خزمی خەون بینەکەیە بڕینی داری سنەوبەر تەڵاقدانی دەسگیرانە دانیشتن لە بن داری سنەوبەر گەیشتنە بە ئاوات چاندنی کردنی کارێکە کە سوودی هەیە بۆ داهاتووی.

ساڵنامە: تەقویم:

بەدەست کەوتنی لە خەودا دۆستێکە کە هەموو کات دەیەوی تووشی قازانجت بکات بەڵام دەستەڵاتی نیە:

سالح پێغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی سالح پێغەمبەر لە خەودا تووش بوونی کوێرەوەری‌یە لە لایەن ناکەسان بەڵام ئەنجام ئەو سەردەکەوێ:

سلەیمان پێغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا دروودی خوای لێ بێ ئەوە پایەی بەرزە کەسێک لای وابوو سلەیمان پێغەمبەر ئەنگوستیلەی دایە ئەوە ئەو کەسە بە ئیمانەوە دەمرێ. ئەگەر لای وابوو سلەیمان لە سەر جێگایێ بەرز ووتار دەدات دەنگو باسی گرنگ لەو وولاتە پەیدا دەبێ ئەگەر ژنێک بە خزمەتی گەیشت ئەوە کورێکی زاناو لێهاتووی دەبێ:

(سدرة المنتهى):

چوون بۆ ئەوێ لە خەودا بۆ هەر کەسێک مردنی کەسەکەیە بە ئیمانێکی تەواوو پتەو.

سارا خاتوون:

بە خزمەت گەیشتنی بۆ پیاو سەفەر کردنی دووروو درێژە بەڵام بۆ ژن هەوێ بە سەر هێنانی ژنەکەیە:

سوولکەی ئاو پسوولکە: سولاف:

کەسێک لای وابوو ئاوی سوولکەی ڕووناکی بە سەردا دەڕژا لە خەودا ئەوە تۆبەی دەکات لە گوناحان بەڵام ئەگەر ئاوی لێڵ بوو ئەوە تووشی غەمی زۆر دەبێ بە هۆی کردنی ئیشی دژی دەسەڵاتی میرییەوە.

ساتۆر: سیکارد:

بەدەست کەوتنی ساتۆر ئاشتی کردنە لە نێوان دوو شەڕکەر شکانو کۆلی بێهێز بوونی خاوەنەکەیەتی:

سان: هەسان:

بەدەست کەوتنی لە خەودا برادەرێکی دڵ سووزە هەسوونی تیغ بە هەسان لە خەودا ئامادە کردنی شتی غەزا کردنە:

سمـــاق:

خواردنیو چنینی لە خەودا مارە کردنی ژنێکی نابەدڵە بۆ هەردووکیان چاندنی سماق نانەوەی کارێکە کە ئاژاوەی دوا ڕۆژی هەیە:

سوجدە: کوڕنوش:

سوجدەی سوپاس لە خەودا بردنی ڕەزامەندیە بە هەموو فەرمانی خوا: سوجدەی نوێژ بردنی لادانە لە کردنی بێفەرمانی خوا. سوجدەی قوڕآن خوێندن بردنی حەج کردنە.

سیـــر:

خواردنی بە کوڵاوی بۆ نەخۆش چاک بوونەوەیە: بۆ لەش ساغ دەوڵەمەندیە چاندنی سیر قـــە کردنی بێسوودە:

سێو:

بۆن کردنی سێو بۆ کچ مێرد کردنە. بۆ کوڕ ژن هێنانە. خواردنی سێوی شیرین دەوڵەمەندیە. هی ترش ماڵی حەرامە. چاندنی نەمامی سێو بەخێو کردنی ماڵی هەتیوە:

سوولی یەرم: چلورە:

پەیدا بوونی چلورە لە زستاندا خێرو خۆشیە بۆ هەرێمەکە. بەڵام لە

کاتی دیدا بڵاو بوونەوەی درۆو دەڵەسەیە.

سابات: کەپر:
دانیشتنی لە بن سابات گرتنی ڕێبازی یارانی پێغەمبەرە(د.خ) ڕووخانی سابات لە هەرزنێک لادانە لە فەرمانی خوا بە تایبەتی خاوەن ساباتەکە.

سێبەر: نسێ:
دانیشتن لە ژێر سێبەری شاخ پشت بەستنە بە کەسێکی بەهێز بۆ کاروباری ژیان بەڵام لە بن سێبەری داروو خانوو پشت بەستنە بە ژنی خۆی کە جێی بڕوانیە.

سەبەتە:
بڕوانە تریان:

سەگ: کسۆک: سە: کۆپەک:
کەسێ لای وابوو لە خەودا سەگ گەستی و برینداری کرد ئەوە لە لایان ناحەزانی زیان دەبینی: کەسێک لای وابوو سەگێ هار پەیدا بووە لە وڵات ئەوە پاشاێکی زۆردار دێتە سەر کار کەسێک لای وابوو دێڵە سەگێکی دەست کەوت ئەوە ژنێکی زۆر وەڕی تووش دەبێ دیتنی سەگی شوان دیندارەیە: کەسێک لای وابوو تاژی دەست کەوت پایەی بەرزی دەست دەکەوێ کوشتنی سەگ گەیشتنە بە ئاوات خواردنی گۆشتی سەگ خزمەت کردنی باب و داکە کەسێ لای وابوو سەگ قسەی لەگەڵ کرد ئەوە دینی بەهێز دەبێ. دیتنی سەگی (اصحاب الکهف) خواپەرستی یە بە دڵ سۆزی.

سینک: دەندە:

فراوان بوونی سینگ لە خەودا بڕوای تەواوە بە خوا. تەنگی کافر بوونە: هێشانی سینگ تاوانباری بەرانبەر بە باب و داک پەیدا بوونی مەمک لە سەر سینگی پیاو دڵداری کردنە لە گەڵ کچی منداڵ.

سی مرغ:

کەسێک لای وابوو سی مرخی گرت ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبێ سوار بوونی سی مرغ سەفەر کردنە هەڵ گرتنی سی مرغ جیماع کردنی نابەدڵە لە گەڵ ژنی خۆی خواردنی گۆشتی دەست کەوتنی ماڵی حەرامە.

سوێسکە:

بنوارە کەو:

سوانکیلە:

گرتنی و گۆشت خواردنی پەیدا بوونی کورێکی دەردەدارە:

سورەتەکانی قورآنی پیرۆز

سورەتی الفاتحة:

خوێندنی بەرەوانی لە خەوداکردنەوەی خێرو بەرەکەتە بۆ خوێنەر.

البقرة:

خوێندنی لە خەودا ئامۆژگاری کردنی خێزانی خۆیەتی بۆ چاکە کردن.

النساء:

بەدەست کەوتنی میراتە لە لایان ژنەوە:

المائدة:

دڵپاکی‌یە بەرانبەر بە ئایین:

الانعام:

گرتنی ڕێبازی دیندارانە: هەروەها خێر کردنە بە هەژاران:

الاعراف:

سەفەرێکی دووروو درێژو بەسوودە:

الانفال:

زاڵ بوونە بە سەر دووژمن و دەوڵەمەندی‌یە:

التّوبة:

فەرمان کردنە بە چاکەو بەرگری کردنە لە خەراپە بە پێ‌ی توانا:

سورەتی یونس:

خوێندنی لە خەودا رزگار بوونە لە بەڵای گەورە.

هود:

تووش بوونی دووژمنی زۆروو بە جێ هێشتنیووڵاتە:

یوسف:

دەست کەوتنی پایەی بەرزە. هەروەها حەسوودی بردنی کەس و کارتی بە ئەو.

الرعد:

نزیکبوونەوەی مردنە.

سورەتی ابراهیم:

خزمەت کردنی مزگەوتەو ماڵ سەرف کردنە بۆ خواو چوونی حەجە.

النّحل:

گرتنی ڕێی شەریعەتە وە بۆ نەخۆش چاکبونەوەیە. بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یە بەزۆری.

الاسرار:

شاهیدی دانی بە ڕاستی‌یە.

الکهف:

خوێندنی لە خەودا حەجکردنە بە ماڵی پاک.

سورة مریم:

خوێندنی بوختان کردنە بە ئەوکە ئەنجام دەردەکەوێ بە پاکی خوێنەر.

طــه:

خوێندنی لە خەودا لادانە لە فەرمانی خوا.

الانبیاء:

بەدەست کەوتنی ماڵی زۆروو بڕوای پتەوە بە خوا.

الحج:

چوونی حەجوو پایەی بەرزە:

المؤمنون:

خوێندنی لە خەودا بۆ نەخۆش چاکبوونە بۆ هەژار دەوڵەمەندیە.

النّور:

فێر بوونی زانیاری و پایەی بەرز دەست کەوتنە:

الفرقان:

کردنی دینداری زۆروو بڕوای بەهێزە:

الشعراء:

گرتنی ڕێبازی دیندارانە:

النّمل:

خوێندنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ژنو منداڵی گوێ ڕایەڵە:

العنکبوت:

بەدەست کەوتنی پایەی مەزنە بەهۆی ماڵی دونیاوە:

**الرّوم:**

بەریەرەکانی کردنە لەگەڵ کەمێکو زاڵ بوونە بە سەریا.

**سورة لقمان:**

خوێندنی لە خەودا بوونی خوێنەرە یان خۆی یان خزمێکی بە پزیشکی زاناوو بەسوود.

**السجدة:**

خوێندنی لە خەودا دینداری ڕاستەقینەیە:

**الاحزاب:**

یارمەتی دانی هەژارانو دیتنەوەی هەندی پارەی کەوتووە دانەوەیەتی بە خاوەنەکەی بۆ خوا.

**السباء:**

خوێندنی لە خەودا بەدەست کەوتنەوەی ماڵێکە کە ناحەزان لێیانساندووە.

**الفاطر:**

زاڵ بوونە بە سەر دووژمنانی دیندا بە گفتگۆ کردن لە گەڵیاندا..

**یسین:**

تۆبە کردنە لە گوناحان:

الصافات:

پەیدا بوونی ئەولادی بلشە:

سورتی (ص):

سوێند خواردنە بۆ ئاشکرا بوونی ڕووداوێک:

الزمر:

خوێندنی لە خەودا دڵنیایی لە فێڵی فێڵ کەران:

الغافر:

زۆر کردنی زکری خوایە:

فصلت:

بە جێ هێنانی فەرمانی یەزدانە بە دڵ سۆزی:

سورەتی شوری:

خزمەت کردنی هەژارانە: کردنی کاری بەسوودە بۆ وڵات: سەرکەوتنە لە ژیاندا.

الزخرف:

جێ بەجێ کردنی ئیشی هەژارانە:

الأحقاف:

سەرف کردنی ماڵە بۆ چاکە:

جاثیه:

کردنی ئیشێکه که پەشیمانی له دوایه:

سورەتی محمد:

له خەودا خوێندنی پەیدا بوونی کوڕێکی باش و کردار جوانه:

الفتح:

دوعا قەبوڵ بوونو زاڵ بوونه به سەر دوژمندا:

الحجرات:

به جێ هێنانی سیلەی ڕەحمه هەروەها دڵ پیسی یه بەرانبەر به خەڵک.

سورەتی (ق):

گرتنی ڕێگەی ڕاستی دین پەرستنه.

الذاریات:

ناوبژی کردنه بۆ ئاشتی له ناو موسوڵمانان:

الطّور:

پەشیمانی یه له قسه کردن:

النجم:

دڵ ڕوونـاکـی یه بـەهۆی پـەرستنی ئـایینی مـەزنی ئـیسلامەتی:

القمر:

ئاسان بوونی کاری حەستەمە:

الرحمن:

خۆ پاراستنە لە درۆووە دەڵەسە:

الواقعة:

دەوڵەمەندی‌و تۆبە کردنە لە گوناحان:

الحدید:

هێزوو دەستەڵاتە بە سەر کاری دونیادا:

المجادلة:

دینداری‌یە بە دڵ سۆزی:

الحشر:

یارمەتی دانی دیندارانە:

الممتحنة:

گەڕانەوەیە لە بیرباوڕی دژی ئایین بۆ بیروباوڕی پاک:

الصف:

غەزا کردنە بۆ خوا

**الجمعة:**

کردنی کاروباری کۆمەڵایەتی یە:

**المنافقون:**

دوودڵی یە بەرانبەر خوا زیان دێتە لە ناحەز.

**التغابن:**

خوێندنی لە خەودا نەکردنی نوێژو رۆژووە:

**الطلاق:**

بەربەرەکانی کردنە لە گەڵ ژنەکەی.

**سورة التحريم:**

خوێندنی لە خەودا پەیدا بوونی ئاژاوەی ناو ماڵە بەهۆی ژنەکەی.

**الملک:**

ڕزگاری یە لە ئازاری گۆڕ.

**المعارج:**

دەست کەوتنی پایەی بەرزو ژیانی خۆشە:

**سورەتی نوح:**

خوێندنی لە خەودا ڕزگاری یە لە بەلاّیێکی گەورە زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا

سورة الجنّ:

خوێندنی لە خەودا ترسانە بە شەو بەهزی بیر کردنەوەی پرو پوچ.

المزمل:

گرتنی سونەتی پێغەمبەرە د.خ.

المدثر:

فەرمانە بە چاکە بەرگری یە لە خراپە.

القیامة:

تووش بوونی زۆرداری لە لایان پاشای وڵات.

الدهر:

یارمەتی هەژارانە بە بەرگ و خواردن.

النّباء:

بیرکردنەوەیە لە بوونەوە روو بڕوای پتەوە بەخوای مەزن.

النازعات:

ترسانە لە غەزەبی خوا..

سورة عبس:

شکانی دڵی پیاوی دیندارە.

**كوَّرت:**

تروش بوونی دەردرو ئازاوە.

**الانفطار:**

بە دواكەوتنی دونیایەو خوا لە یادكردنە:

**الانشقاق:**

نزیكیبە لە خوا بە كردەوەی باش:

**البروج:**

تروش بوونی ئازارە لە سەر دین.

**الاعلی:**

زكر كردنی خوایە بە دەوام:

**الطارق:**

پەیدا بوونی كوڕێكی خواپەرستو خوێندەوارە.

**الغاشیة:**

یارمەتی كەسێكە كە پەشیمانی لە دوایە:

**الفجر:**

حەج كردنە: سوودی زۆرە لە كردنی بازرگانی:

سورة البلد:

خوێندنی لە خەودا زەکات دانی ماڵە.

الشمس:

کردنی ئیشی ناشیرینە:

اللیل:

ئەمین بوونە لە دەردوو بەڵاو خێر کردنە بە هەژاران:

الضّحی:

یارمەتی دانی خوێندەوارانە.

الانشراح:

ئاسانی کاروباری ژیانە:

التّین:

چاکبوونەوەیە لە نەخۆشی و ڕزگاری‌یە لە هەژاری:

العلق:

زوبان ڕەوانی‌و قســە زانینە.

القدر:

تەمەنی درێژ بە شادی:

البيّنة:

گەڕانەوەی هەندێ تاوانبارانە بۆ چاکە بە قسەی ئەو:

الزلزلة:

کەسێ لای وابوو خوێندی لە خەودا ئەوە زۆرداری دەکا لە هەژاران.

العاديات:

ڕقەبەری‌یە لەگەڵ ناڕەسەنان:

القارعة:

بە دەست کەوتنی پلەی بەرزە لە ژیاندا.

التكاثر:

هات و چۆ کردنی پیاوانی ئایینی‌یە کە سوودی هەیە.

العصر:

تووش بوونی کارێکی ئەستەمە بەڵام ڕزگاری لە دوایە.

الهمزة:

کۆ کردنەوەی ماڵی دونیاو خواڵە یاد کردنە.

الفيل:

یارمەتی دانی زۆردارانە.

القریش:

خۆشەویستی‌یە لای خەڵک.

الماعون:

نەکردنی نوێژە بە تەنبەڵی.

الکوثر:

خوێندنی لە خەودا دەوڵەمەندی‌یەو خێر کردنە بە هەژاران بۆ خوا.

النّصر:

کردنی ئیشی بە سوودو زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا.

الکافرون:

خوێندنی بە دواکەوتنی ڕێگەی دژی ئایینی ئیسلامەتی‌یە.

سورة المسد:

فێڵ کردنە لە خەڵک.

الاخلاص:

خوێندنی لە خەودا بڕوای تەواوە بە خواو وەجاغ کوێری‌یە.

سورة الفلق:

ڕزگاری‌یە لە غەمو دەردو بەلا.

سورة النَّاس:

خوێندنی لە خەودا دڵ پاکیو بڕوای پتەوە بەرانبەر بە ئایین.

سەر:

گەورە بوونی بەدەست کەوتنی پایەی بەرزە بچووکی نزمی خاوەنەکەیەتی. هەبوونی دووسەر زاڵ بوونە بە سەر ناحەزاندا ڕووت کردنی سەر لادانە لە فەرمانی خوا: سەر لێ کردنەوە لە خەودا بۆ نەخۆش چاک بوونەوەیە بۆ غەمبار شادییە: هێنانی سەر ئازاردانی باوکە: سەرنەوی کردن تۆبە کردنە لە گوناحان: هەڵ گرتنی سەری ئادمیزاد بەدەست کەوتنی هەزار دینارە بەڵام هی شێر دەست کەوتنی پایەی بەرزە. کەسێ لای وابوو سەری بووتە سەری کەرئەوە تووشی دەردەسەری دەبێ لە ژیاندا. ئەگەر لای وابوو بووتە سەری دڕەندە ئەوە خەریکی کارێکە کە لە توانای ئەو نیە سەربڕینو جێ خۆ گرتەوە مردنی بە شەهیدییە. تاشینی ڕزگارییە لە خەم.

# « پیتی شین »

شەهید:

دیتنی شەهید لە خەودا هەروەها شەهید بوون لە خەودا کردنی فەرمانی باشە بە خەڵک بۆ گرتنی ڕێی ئایین پەرستن.

شیث پێغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا بەدەست کەوتنی منداڵی چاکەو ژیانی شادیبە.

شوعەیب پێغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا زۆر بوونی فێڵە لە کێشانو پێوان کەسێ لای وابوو شوعەیب دەلەرزێ ئەوە ئەو کەسە هەردوو چاوی کوێر دەبێ.

شوتی: شفتی: شامی:

خواردنی لە خەودا قوت دانەوەی ڕقەلەو کەسەی خراپەی لە گەڵ کردووە هەروەها ئامۆژگاری ماڵو منداڵی خزیەتی بۆ چاکە کردن و بە قسەی ناکەن.

**شفته:**

خواردنی لە خەودا بۆ کچ مێرد کردنە بۆ کور ئازار دانی باب و داکیتی بۆ پاشا کەم بوونی دەستەلاتە بۆ بازرگان سوودی کەمە: بۆ ژنی بە مێرد تەلاق دانە.

**شەپور: بۆقیە: کەرەنا:**

لێدانی لە لایان سەربازەوە بلاو بوونەوەی دەنگ و باسی ترس هێنەرە لە لایەن مەلاوە بلاو کردنەوەی فەرموودەی خوایە: لە لایەن بازرگان قازانجی زۆرە لە لایەن جوتیار سووتانی خەرمانە:

**شەب: ئاخ:**

خواردنی بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە بۆ لەش ساغ ژیانی شادییە بۆ جوتیار دەرامەتی باشە لە کشت و کاڵ:

**شـــەڕ:**

شەر کردنی ژن و مێرد خۆشەویستییە: هی دوو عەسکەر پەیدا بوونی دەردوو بەلایە بۆ هەرنمەکە هی دووکەس سوود بە یەکتری گەیاندنە:

**شینایی:**

بنوارە سەوزە:

**شەیتان:**

ئەگەر لای وابوو شەیتان شتێکی دابە کەسێک ئەو کەسە تووشی

حەرام خواردن دەبێ کوشتنی شەیتان یەک گرتنی موسوڵمانانە. دیتنی شەیتان بە شادی مێبازی کردنە ئەگەر شەیتان ویستی کەسێک بگرێ بەڵام بەهۆی زکر کردنی خوا نەیتوانی بیگرێ ئەوە ئەو کەسە دووژمنی دەیەوێت تووشی زیانی بکات و ناتوانێ:

ئەگەر لای وابوو شەیتان چاوی لێ هەڵ دەتکێنی ئەوە کەسێک دەیەوێ حەز لە ژنی بکات کەسێ شەیتان قسەی لەگەڵا بکات ئەوە بە دزی دینداران دەجوڵێتەوە ئەگەر لای وابوو لە شەیتانی دەدا ئەوە ڕزگاری لە غەم و پەژارە.

شەق:

لێدانی شەق و شەپازللە لە کەسێک لە خەودا سوود پێ گەیانە ئەگەر ئێشی هەبێت ئەگەر نائەوە داوای یارمەتی یە لەو کەسەی شەقەکەی لێداوە.

شیعر:

هۆنینەوەو خوێندنەوەو نووسینەوەی شیعر ئەگەر بۆ دڵداری بێ ئەوە قسەی بێ سوودە. وە ئەگەر شعیری ئایینی بێ ئەوە بە خزمەت گەیشتنی پی غەمبەرە لە خەودا د.خ: دیتنی شاعر لە خەودا برادەرایەتی کەسێکی حیلەبازە:

شێتی:

شێت بوون لە خەودا کەم دینی یە: شەڕ کردن لەگەڵ شێت تووش بوونی دەردە.

شمشێر:

بەدەست کەوتنی شمشێری جوان ژنی کابانو ئادامە. بۆ ژنی بێ مێرد مێرد کردنە شکانو کوڵی شمشێر منداڵی مردووە لە زگی دایکیا بەڵام رزگار بوونی دایکە کەیە هێنانەدەری لە کالان بۆ لێدانی کەسێک خەریکبوونە بە فێڵ کردن لەو کەسە بەڵام وازدێنێ. لێدانی شمشێر لە کەسێک کە ئازاری نەبێ ئامۆژگاری کردنە کەسەکەیە کە بێ سوودە بەستنی شمشێر لە قەدوو لە شان تەمەن درێژی‌یە شمشێری زێڕ پایەی بەرزە بەڵام هی مسو ئاسنو گڵو داردەست کەوتنی ماڵی دونیایە شکانی شمشێر بەبێ کالان مردنی خاوەنەکەیەتی.

شەروار:

جوانی شەروار ئارامیو بەرزی‌یە. دڕانیو چڵکنی کردنی کاری بێ ئابڕووانەیە درێژی لە ئەندازە بە دەر گوناح کردنە. کورتیو سووتانی هەژاریو چوونی ئابڕووە بەهۆی دڵداری لەگەڵ ژنێکی چەنەهەراش.

شەمامە:

دەست کەوتنو بۆن کردنی دینداری‌یە. خواردنی لادانە لە فەرمانی خوا.

شیر:

خواردنەوەی شیر لە خەودا بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە. بۆ کچ مێرد کردنە. بۆ کوڕ ژن هێنانە بەڵام شیری ئاژەڵی گۆشت حەرام خواردنی. خواردنی شیربایی‌یە دۆشینی شیر کردنی کاسپی حەڵاڵە رژانی شیر کەم دەرامەتی‌یە بۆ ئەوەی لێی رژاوە. خۆ شوشتن بە شیر تۆبە کردنە لە گوناحان.

شەلگەیێری:

دیتنی شەنگەیێری سالی خۆش و هەرزانی یە.

شەمشەمە کوێرە: چەک چەکیلە:

گرتن و گۆشت خواردنی دەست کەوتنی مالی حەلالە بەزۆری. کەسێ لای وابوو بە کۆمەل چەک چەکیلە هاتن بۆ مالی ئەوە ژنێکی رەسەنی دەست دەکەوێ.

شەرم کردن:

ئەگەر لە سەر نان خواردن شەرمی کرد ئەوە تووشی هەژاری دەبێ و ئەگەر لە بەر کردەوەی ناشیرین بوو ئەوە تۆبە دەکات لە گوناحان ئەگەر شەرمی دەکرد لە کەسێک بە بێ هۆ ئەوە تووشی ئازاوەی مال دەبی بەهۆی ژنی چەنەبازو بێ هۆش.

شادی: کەیفی خۆش:

لە خەودا شادمانی گەیشتنە بە ئاوات: کەسێ لای وابوو بەبێ هۆی دیاری شاد بوو ئەوە دینی بەهێز دەبێ.

شاهیدی:

کەسێک لای وابوو بووبوو بە شاهید بۆ کۆتایی رووداوێک ئەوە دەبێتە سەرۆکی کۆمەلێکی گوێ رایەل.

شنگ: شواشینک:

دیتنی داری شنگ لە خەودا دەست کەوتنی ژنێکی هۆشیارو کابانە.

چاندنی داری شنگ بەدەست کەوتنی پایەی بەرزە.

**شەمی: مێو:**

بەدەست کەوتنی و خواردنی مارەکردنی ژنێکی دەست و دامەن پاکە وە بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە.

**شێلمە: شەڵغەم:**

بەدەست کەوتنی و خواردنی لە خەودا دۆزینەوەی پارەی کۆنە کە ڕەواجی کەمە لە بازاڕدا.

**شەوارە:**

گرتنی شەوارە بۆ کوڕ دینداریە. بەڵام بۆ کچ خەریکبوونە بە کاری ئەستەم.

**شەوە: ئاڵ:**

کەسێ لای وابوو لە خەودا شەوەی دی ئەوە بیر کردنەوەیە لە کارێکی بێ سوودو بێ ئەنجام.

**شەوچەرە:**

کەسێک لای وابوو لە ماڵێکدا شەرچەرەی خوارد ئەوە لەو ماڵە کچێ داخوازی دەکات بۆ کوڕەکەی.

**شەنگەبێ: شۆرەبێ:**

دیتنی لە خەودا هۆی شادیە: چاندنی لە خەودا داپۆشینی ئابڕووی

ژنێکە کە بوختانی پێ کراوە: بڕینی. بوختان کردنە بە ژنی بێ تاوان:

شـــار:

چوونی ناوشار ڕزگاری‌یە لە ترس. وێران بوونی شارێک گوناحباری خەڵکی شارەکەیە کەسێ لای وابوو لەرزە شاری وێران کرد ئەوە باوکی دەمرێ چوونی شاری عارەبان زۆر بوونی دەرامەتی کشت‌و کاڵە بۆ کابرا. چونی شاری قدوس‌و بیت لحم دینداری‌یە چونی شاری شام شادی‌یە چوونی بەغدا تووش بوونی ڕقە بەری‌یە لە گەڵ کەسێکی کەم دین. چوونی هیندوستان زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا. چوونی تورکیا بڕوای پتەوە بە خوا. چوونی یەمەن ئەمین بوونە لە دووژمن. چوونی وڵاتی مەغریب پایەی بەرز بەدەست کەوتنە. چوونی شاری فارسان تووشی کاری بێ ئابڕوانەیە.

شەکر:

خواردنی شەکر لە خەودا فەرمان کردنە بە چاکە: تواندنەوەی شەکر لە ناو ئاودا مانالیدانەوەی قورئانی پیرۆزە: سووتاندنی شەکر ئامۆژگاری کەسێکە کە بێ سوودە.

شقارتە: شەمچە:

بەدەست کەوتنی شقارتە کە سەری دەنکەکانی زەرد نەبی ئەوە شادی‌یەو دڵ خۆشی‌یە بەڵام ئەگەر دەرمانی سەری دەنکەکەی زەرد بوو ئەوە نەخۆشیو دەردە.

شەنە:

دەست کەوتنی شەنەی دەمک ئاسن هێزور دەستەلاتە بەلام هی دەمکدار دەرامەتی زۆری کشت و کاڵی ساڵە: شکانی شەنە لە ناو چوونی خەرمانی دەغڵە بە هۆی سووتان بۆ خاوەنی شەنەکە:

شووارک: شوڕک:

بەدەستەوە گرتنی لە خەودا دەستەلاتە بۆ خاوەنەکەی شکانی بێ دەستەلاتی بە لێدان بە شوڕک لە هەر کەسێک سوود گەیاندنە بە کەسەکە: لێدانی لە کەر نزایە لە بەر خوا بۆ ژیانی خۆش:

شەدە: مشکی:

لە سەرنانی بۆ پیاو ئەگەر ئاوریشم بێت لادانە لە فەرمانی خوا بەلام بۆ ژن بەختەوەری یە لای مێردی.

شەوگەرد:

کەسێک لای وابوو لە خەودا شەوگەرد پی یەوەداو هێشاندی ئەوە دووژمن زیانی لێدەدات. کوشتنی شەوگەرد ئەمین بوونە لە دووژمن:

شەپۆیە: مەکوک:

بەدەست کەوتنی و ئیش پێ کردنی بۆ خوێندەوار دانانی هۆنراوەیە. بۆ بازرگان قازانجی زۆرە لە بازرگانی بۆ جۆلا ژیانی شادی یە. بۆ ژن زینا کردنە بۆ کچ یان پانتۆک کردنە لە گەڵ کچێکدا:

شنەی با:

هاتنی لە وولاتی لاچوونی دەردو خەفەتە لە ناو خەلکی وولات.

شارەوانی:

دیتنی مەلبەندی شارەوانی بە جوانی دادی پاشای وولاتە ڕووخانی زۆرداری پاشایە.

شۆربا:

خواردنی لە خەودا دل سووتانو بەزەیی‌یە بە هەژاران وە بۆ نەخۆش چاکبوونەویە.

شەوڕۆ:

شەوڕۆ کردن لە خەودا لە لایان کەسێک ئەو کەسە دەیەوی بیبێتە گزیری ئاغا یان کاربەدەستی میری.

شێر:

سوار بوونو ڕام کردنی شێر سەرکەوتنە بە سەر کۆسپی ژیاندا. خواردنی گۆشتی غەیبەت کردنی پاشای وولاتە. لە بەر کردنی کەولی شێر دەست کەوتنی پلەی بەرزە. زیڕەی شێر بلاو بوونەوەی دەنگو باسی بەترسە کوشتنی شێر جێ‌بەجێ کردنی ڕووداوێکە بە ئاشتی کە زۆر سوودی ئایینی هەیە شەر کردن لە گەل شێر ڕقەبەری‌یە لە گەل زۆردارێک. شێرگان گەیشتنە بە ئاوات. ئەگەر کەسێک لای وابوو شێرگای ئەوە خزمو کەسی خۆی لێ دوور دەبەوە. ئەگەر شێر بریندرای کرد ئەوە لە لایان ناحەز تووشی زیان دەبێ هەلاتن لە بەر شێر ڕزگاری‌یە لە دووژمن.

شه: شانه:

ئه‌گەر لای وابوو ریشوو سمێلی به شانه‌کردن ئه‌وه زه‌کاتی ماڵی ده‌دات به هه‌ژاران ئه‌گه‌ر ژنێک لای وابوو سه‌ری به شانه‌کرد ئه‌وه مێردی ده‌مرێ. ده‌ست که‌وتنی شانه‌ی زێڕ براده‌ری باشه:

شــــور:

گرتن و کوشتنه‌وه‌ی چاکه‌کردنه له‌گه‌ڵ که‌سێکی سپڵه ڕام کردنی شور گرتنی براده‌رێکی بێ ئه‌مه‌که:

شه‌داو: تۆڕ:

درووست کردنی له خه‌ودا بنیات نانی ئیشێکی بێ سودو بێ ئه‌نجامه.. هاوشـتـنه ئاوی تۆڕ بۆ گرتنی ماسی ئه‌گه‌ر ماسی گرتن ئه‌وه ماڵی دونیایه ده‌ستی ده‌که‌وێ:

شینه شاهو:

گرتنی له خه‌ودا دۆستایه‌تی‌یه له‌گه‌ڵ که‌سێکی هوشیار. خواردنی گۆشتی حه‌ج کردنه فڕینی له ده‌ست چوونی براده‌رێکی ئارامه:

شـــه‌و:

که‌سێ لای وابوو له ناو شه‌ودا بوو ئه‌وه ته‌نبه‌ڵه له ئیشوو کاری خوێندا که‌سێک لای وابوو شه‌وه به‌ڵام مانگ شه‌وقی ده‌دا. ئه‌وه پاشای وولاّت کاروباری داوه‌ته ده‌ستی وه‌زیرێکی خۆی که ئه‌و وه‌زیره بارمه‌تی دزان ده‌دا بۆ دزی کردن. دیتنی شه‌وی تاریه به هه‌وری تریشقه‌دار بێ ئه‌مری

کردنی خەڵکی هەریمەکەیە بۆ فەرمانی خوا. کەسێ لای وابوو لە دوای شەو بەیانی دا ئەوە ئەگەر نەخۆش بوو چاک دەبێت ئەگەر خەمبار بوو شاد دەبێ ئەگەر قەردار بوو قەرد دادەتەوە دیتنی شەوانی پیرۆز وەکوو شەوی جومعەو (لیلةالقدر)و شەوی بەرات. دینداری‌یە بە دڵ سۆزی:

شوێن کەوتن:

کەسێک لای وابوو لە خەودا شوێنی کەسێک کەوت ئەوە ڕەفتاری ئەو کەسە دەگرێ لە ژیاندا:

# « پیتی ژێ »

ژن: ئافرەت:

مارە کردنی ژنی گەنجو جوان لە خەودا ژیانی شادی‌یە و تەن.. درووستی‌یە بەڵام ژنی پیروو ناشیرین تووش بوونی خەمە: دیتنی ژنی نەناسراوی ناشیرین ساڵێکی بێ بارانو بێ‌دەرامەتی‌یە:

ژاڵە: لورک:

بۆون کردنو چینی گوڵی ژاڵە مارە کردنی ژنێکی چەنە بازە چاندنی گوڵی ژاڵە فوت دانەوەی رِقە بەرانبەری رِەفتاری ناڵەباری ژنی خۆی:

ژاژی:

خواردنی ژاژی لە خەوداکردنی ئێشێکە کەلای ناخۆشە بەڵام سوودی هەیە بۆی لە ئەنجامدا:

ژووان:

ژووان گرتن لە گەڵ ژن بنیات نانی کارێکە کە هۆی دەوڵەمەندی‌یە

ژەک: فرچک:

خواردنی لە خەودا تەماشا کردنی ژنێکە بە دڵی پێوە کە ژنە کەشی پی‌ناشی بە فەرموودەی شەریعەت:

ژەهر:

کەسێک لای وابوو ژەهری دا بە کەسێک ئەوە زینا لە گەڵ ژنی کابرا دەکا ئەگەر بە خواردنی ژەهر بەدەنی ئەستوور بوو ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبێ.

ژیانەوە:

ئەگەر لای وابوو کەسێکی مردوو ژیایەوە ئەوە بە شەهیدی مردووە:

ژان:

بڕوانە ئازار:

ژاندن:

کەسێک لای وابوو لانک دەژەنێ ئەگەر لانکەکە کوڕی تێدابوو ئەوە دەوڵەمەندی‌یە: بەڵام ئەگەر کچی تێدا بوو ئەوە گران بوونی نرخی دەغلوو دانە ژانینی مەشکەی دۆو جێ‌بەجێ بوونی مەبەستەکەیەتی کە زۆر زۆر سوودی لێ دەست دەکەوێ.

ژیری:

لە خەودا کەسێک لای وابوو ژیر بووە ئەوە سەفەرێک دەکات بۆ موعامەلە کردن بەڵام تووشی زیان دەبێ: کەسێک لای وابوو پیاو ووت لە خەودا ئەتو زۆر ژیری ئەگەر ئەوەی پێ‌ی ووتووە بیناسێ ئەوە دەیەوێت حیلەی لێ بکات وە ئەگەر نەیناسێ ئەوە پیاوێکی مەزن میوانی دەبێ:

# « پیتی عەین »

**عەرشی خوا:**

دیتنی لە خەودا بڕوای پتەوە. دیتنی خوا لە سەر عەرش خوراناسینی تەواوە. ئەگەر لای وابوو لە سەر عەرشی خوایەو خواش لە بن عەرشە ئەوە بەرانبەر بە باب و داکی تاوانبارە. دیتنی عەرشی خوا بە نارێکی پەیدا بوونی شتی دژی ئیسلامەتی یە:

**عەنبەر:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا دەولەمەندی یە بە هۆی بازرگانی حەلاڵ..

**عیسی د.خ پێغەمبەر:**

بە خزمەت گەیشتنی و دەست ماچکردنی وازهێنانە لە دونیاو خواپەرستی ڕاستەقینەیە ئەگەر لای وابوو عیسی شتێکی دایە ئەوە یەکێک لە خزمەکانی دەبێتە پزیشک و زۆر سوودی کۆمەڵی دەبێ: مردنی عیسی لە هەرێمێک کز بوونی دینداری یە:

**عوزەیر د.خ پێغەمبەر:**

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا بەدەست کەوتنی پایەی مەزنە:

عیزرائیل:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا ئەگەر رووی خۆشبو دینداری‌یە ئەگەرنا تاوانباری‌یە. شەڕکردن لەگەڵ عیزرائیل ئەگەر سەرکەوت تەمەن درێژی‌یە ئەگەر بن کەوت مردنی بە زووی‌یە: ئەگەر لای وابوو عیزرائیل هات بۆ گیان کێشانی و نەی‌کێشا ئەوە تەمەنی درێژ دەبێ ئەگەر کێشای ئەوە نەن درووستی‌یە: دیتنی لەهەرێمێک زور بونی خواپەرەستی وە لاچونی شتی دژی ئیسلامەتی یە

عەلی کوڕی ئەبوتالیب:

دیتنی لە هەرێمێک زور بونی خواپەرەستی بە ولا چونی شتی دژی ئیسلامەتی‌یە.

عومەری کوڕی خەتتاب:

دیتنی لە هەرێمێک بە چەکەوە زۆر بوونی دادپەروەری‌یە بە بێ چەک خواپەرستی‌یە. کەسێ لای وابوو عومەر شتێکی دایە ئەوە نرخی دەغلوودان هەرزان دەبی‌و کابراش پایەی بەرز دەبێ.

عوسمان کوڕی عەففان:

بە خزمەت گەیشتنی‌و دەست ماچکردنی فێر بوونی زانیاری‌یە. عوسمان شتێکی دایە ئەوە دەبێتە زاوای پیاوێکی خواپەرست‌و ڕێزدار. ئەگەر عوسمان قسەی خۆشی لەگەڵاکرد ئەوە قورانی پیرۆز لە بەر دەکات: ئەگەر لە هەرێمێک عوسمانی بە چەکەوە دیت ئەوە لەو هەرێمە دوو بەرکی لە نێوان پیاوانی ئاینی روو دەدات:

عائیشـه‌:

به‌ خزمه‌ت گه‌یشتنی خاتون عائیشـه‌ ژنی پێغه‌مبه‌ر (د.خ) بـه‌ده‌ست که‌وتنی پله‌ی به‌رزه‌ له‌ زانیاری ئاینـدا:

عه‌مره‌:

به‌جێ هێنانی عه‌مره‌ بۆ نه‌خۆش مردنه‌ بۆ له‌ش ساغ ته‌مه‌ن درێـژبوو تۆبه‌ کردنه‌ له‌ گوناحان:

عه‌ره‌فه‌:

وه‌ستان له‌ شاخی عه‌ره‌فه‌ بۆ حه‌ج کردن ئه‌گه‌ر ئه‌و که‌سـه‌ی له‌ خه‌ودا وای دیت ئه‌گه‌ر که‌سێکی ون بووبێ دێته‌وه‌ ئه‌گه‌رنا ئه‌و که‌سه‌ دینداری زۆر ده‌کات:

عاشوراء:

ئه‌گه‌ر سـه‌ید ڕۆژی عاشوراء له‌ خه‌و بینی ئـه‌وه‌ تـووشی بـه‌ڵا ده‌بێ ئه‌گه‌ر سـه‌ید نه‌بوو ئه‌وه‌ تووشی شادی ده‌بێ:

عاره‌ب:

دیتنی عاره‌ب له‌ خه‌ودا له‌ هه‌رێمێک په‌یدا بوونی دوو‌به‌ره‌کی‌یه‌ له‌وێ براده‌رایه‌تی عاره‌ب ڕاو کردنه‌ له‌ دشت و کێو که‌ به‌هۆی ڕاوه‌که‌.. تووشی زیان ده‌بێ:

عـــود:

لێدانی لە خەودا تووش بوونی غەم و خەفەتە. درووست کردنی هاندانە بۆبێ فەرمانی خوای گەورە: هەموو جۆرە مۆسیقا بەم جۆرەیە وەکوو دووزەلەو زورناو کەمانچەو ئەوانیدی وەک شمشاڵ بەڵام لێدانیان لە مزگەوت هاندانی خەڵکە بۆ دینداری لە لایان لێدەرەوە.

## عەورەتی ژن:

دیتنی لە خەودا جێبەجێ بوونی مەبەست و ڕزگاری‌یە لە غەم دەست لێدانی دانەوەی سپاردەی خەڵکە بە تەواوی. دیتنی عەورەتی ژن بە جوانی تۆبە کردنە لە گوناح کەسێ لای وابوو عەورەتی ژنەکەی بچووکە ئەوە بە سەر دووژمندا زاڵ دەبێ کەسێ لای وابوو چووە ناو عەورەتی ژنی ئەوە دەمرێ پیاوی لای وابوو عەورەتی ژنی هەیە ئەو تووشی هەژاری دەبێ مژینی عەورەتی ژنی خۆی شادی‌یە گەستنی عەورەتی هەر ژنێک بەختیاری‌یە ئەگەر ژنێ لای وابوو عەورەتی دیتێ ئەو مێردی ئازار دەدات گەورە بوونی عەورەتی ژنی خۆی زاڵ بوونی دوژمنە بە سەریا.

# « پیتی غەین »

**غەریب: بێگانە:**

دیتنی غەریب لە خەودا سەفەر کردنە کە سوودی هەیە. برادەرایەتی غەریب مارە کردنی ژنێکە خاوەن منداڵە. خزمەت کردنی غەریب گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەجەبە.

**غاردان: هەڕا کردن: بەزین:**

غاردان لە خەودا ئابڕوو چوونە بەهۆی کردنی ئیشی ناڕەوا. کەسێک لای وابوو لە غار کردندا کەوتە سەر زەوی ئەوە دەمرێ.

**غونچە گوڵ:**

بۆن کردن و چنینی لە خەودا مارە کردنی کچێکە کە بە دڵ کچەکە ناڕازییە خواردنی غونچە گوڵ بیر کردنەوەیە لە کاری بێ سوود.

**غـــار:**

بنوارە ئەشکەوت.

**غەیبەت کردن:**

غەیبەت کردنی کەسێک بە هەر جۆرێ لە خەودا خۆی تووشی ئەو شتە دەبێ کەسێ لە خەودا ووتی فوڵان کەس حیلەبازە خۆی دەبێتە حیلەباز.

غەمباری:

کەسێک لای وابوو لە خەودا غەم بارە ئەوە تووشی شادی دەبێ کەسێ لای وابوو مردووێکی بە غەمباری دیت ئەوە لە جەهەنەم دایە پێویستە خزم و کەسی خێری بۆ بکەن:

# « پیتی فێ »

فرمێسک: ڕوواندک:

هاتنی فرمێسک لە چاو ئەگەر ساردبێ شادی‌یە. بەڵام گەرم خەم‌و خەفەتە ئەگەر کەسێک لای وابوو فرمێسکی چاوی ڕاستی دەچووە چاوی چەپی ئەوە کوڕی خۆی خۆشکی خۆی لە خۆی مارە کردووە. فرمێسک مانەوە لە سەر ڕوومەت غەیبەت کردنی خزمی خۆیەتی ئەگەر لای وابوو بەبێ گریان فرمێسکی دێتە خوارێ ئەوە ماڵی حەڵاڵی دەست دەکەوێ.

فێڵ: حیلە:

کەسێک لای وابوو فێڵ دەکا لە خەڵک لە هەر شتێ هەبێ ئەوە تووشی دەردەسەری دەبێ.

فیـل:

دیتنی لە خەودا بە دوواکەوتنی تیر بازی‌یە. سوار بوونی فیل لە خەودا.. زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا. خواردنی گۆشتی فیل خواردنی ماڵی حەڕامە قسە کردنی فیل لە گەڵ هەر کەسێک تووشی ئاستەمە.. بە شەڕ هاتنی دوو فیل شەڕی دوو پاشایە ئەگەر لای وابوو کەوتە بن پێی فیل ئەوە پاشای وولات زۆر داری لێدەکات سوار بوونی فیل سەرەوین لادانە لە ڕێبازی ئایینی ئیسلام.

فیردەوس:

بنوارە بەهەشت.

فنجان:

خـواردنـەوەی قـاوە لە نـاو فـنجاندا دڵداری‌یـە لە گـەڵ کـچی تـازە پێ‌گەیشتوو فنجانی زێڕ پایەی بەرزە بۆ خاوەنەکەی. هی ئاسن و زیوو مس دەست کەوتنی ماڵی دونیایە.

فلوس:

دەست کـەوتنی فـلوسی زیـڕ بـەرزی‌یە لە دونـیادا هـی زیـوو ئـاسن مژدەی خۆشە هی مس و قوڕ زیانی غەماوی‌یە.

فراندن:

فڕاندن هەر شتێ لە خەودا باش نیە. بەڵام فـڕانـدنی قـورئانی پیرۆز ڕێباز گرتنی ئایینی ئیسلامە بە تەواوی.

فاڵچی: ئەتاح فاڵ:

دیتنی لە خەودا تووش بوونی کردەوەی ناڵەبارە کەسێ لای وابوو لە هەرنمێک فـاڵ چـی زۆری لێ‌یـە ئـەوە خـەڵکی هـەرنمەکـە لادەدەن لە شەریعەتی ئیسلام.

فڕن: تەنور

درووست کردنی و نان پێ کردنی خزمەت کردنی مزگەوتە... ڕووخانی فڕن لە هەرنمێک بڵاو بوونەوەی کەم دینی‌یە.

فرۆ:

خواردنی له خەودا چوونی حەجە هەروەها درووست کردنی پرۆژەی چاکەیە وەکوو پردوو مزگەوت.

فـێ:

کـەسـێ لای وابـوو دەردی فـێی گـرت ئـەوە گـوناحکردنی زۆرە. چاکبوونەوە تۆبە کردنە لە گوناحان.

فریز: جیگەی دروتیا کریاگ

چاندنی لە خەوداگرتنی برادەری بە ئەمەکە ویرزەحمەتە هەڵ قەندنی دڵ شکاندنی برادەرانە بە قسەی دروزمان.

فیشەک:

تەقاندنی لە خەودا بڵاو کردنەوەی شتی بێسوودو بێ ئەنجامە

فیشاڵ: هەرەشە:

هەرەشە کردن لە خەودا بەهەموو جۆرێ وە بۆ هەرچی هەبێ کردنی ئەو کارانەیە کە لای کۆمەڵ بێنرخ دەبێ.

فستەق:

خواردنی فستەق لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵی حەڵاڵە بەڵام بە زەحمەت.

فاتیمە کچی پیغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا بۆ ژن مردنی مێردییە بۆ پیاو مردنی

ژنە بۆ کوڕ مردنی بارکە بەڵام بۆ کچ مردنی دایکیتی. دەست ماچکردنی لە خەودا سەیدانە:

**فڕفڕوکە:**

کردن و دەست کەوتنی لە خەوداکردنی کاری سووک و بێ سوودە

**فاقۆچک:**

درووست کردنی و بەر بێهاویشتنی دڵ شکاندنی خەڵکە بە قسەی ناخۆش.

**فیکە: فیتە:**

کەسێک لە خەویا لای رابوو فیکەی دەکرد بۆ هەر شتێک ئەوە دەیەوێ بەهۆی خۆ سپاندن بە سەر کۆمەڵێکدا دەستەڵات پەیدا بکات و سەر دەکەوێ لە ئەنجامدا.

# « پیتی قاف »

**قورئانی مەزن:**

بنوارە سورەتەکان.

**قەڵەوی: گۆشتن:**

قەڵەو بوون لە خەودا بڕوای پتەوە بەخوار دەست کەوتنی پایەی بەرزوو ژیانی خۆشە:

**قایش:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا هەر چەرمێک هەبێ بازرگانی بەسوودە:

**قومری:**

گرتنی لە خەودا بەدەست کەوتنی کوڕێکی قورآن خوێنە. دەنگی قومری دەنگی قوڕآنە: مردنی قورآن خوێنە. هێلانەی قومری جێگەی قورآن خوێندنە:

**قەیماغ:**

خواردنی لە خەودا دینداری‌یە. درووست کردنی شەو نوێژ کردنە:

تومار:

تومار کردن لە خەودا بیر کردنەوەیە لە ئاژاوەیە نانەوە بۆ کەسێک کە خۆی تووشی زیان دەبێ.

قور:

کەوتنە ناو قور لە خەودا تووش بوونی دەردو غەمە: بە کار هێنانی قوری رەش تووش بوونی زیانی دەردەسەری‌یە: دانیشتنی لە ناو قور دەوڵەمەندی‌یە سواق دانی خانوو بە قور گەرانە لە دوو نێربازی سواقدانی مزگەوت یان گوری پیاو چاکان بە قور حەج کردنە

قەڵەم: پێنووس:

بەدەست کەوتنی لە خەودا پایەی مەزنە شکانی لە خەودا هەژاری خاوەنەکەیەتی نووسین بە قەڵەم جێ‌بەجێ کردنی کاری هەژارانە:

قمقۆک: خەگروو: پس پسکە:

کوشتنی قمقمۆک لە خەودا چاکە کردنە لە گەڵ یارانی ئایینی. گرتنی لە خەودا تەماع کردنە لە ژنی جیران.

قۆری:

هێلانەی پس پسکە لە خەوددا دیتنی یارمەتی دزانە بۆ دزی کردن.

قاوە:

خواردنەوەی لە خەودا مارە کردنی ژنێکی گەلحۆی بێ‌هۆشە. کوتانی

قاوەو برژاندنی. ئامۆژگاری کردنی ماڵو منداڵی خۆیەتی بۆ چاکە کردنی کەسوودی نیە.

قوربانی:

کردنی قوربانی لە خەودا بە حەیوانی حەلاڵ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرانە بەلأم بە هی حەرام لادانە لە فەرمانی خوا. خواردنی گۆشتی قوربانی یارمەتی دانی هەژارانە:

قــازی:

دیتنی قازی لە خەودا شادیە: ئەگەر لای وابوو قازی بە دادوەری ئیش دەکات ئەوە خەڵکی هەرێمەکە لەگەڵ یەک دڵپاکن بەلأم ئەگەر لای وابوو قازی بە ناحەق کار دەکات ئەوە خەڵکی هەرێمەکە لەگەڵ یەک دڵ پیسن. کەسێ لای وابوو بووبوو بە قازیو حوکمی دەکرد ئەوە تووشی دەردەسەری دەبێ. مردنی قازی لە خەوداکەم بوونەوەی دادپەروەری یە لە هەرێمەکە:

قەساب:

کەسێ لای وابوو بوێتە قەساب ئەوە ڕووی کردووتە کەم دینی. کەسێ لای وابوو قەساب لە جێ یەکی خەریکی ئاژەڵ سەربڕینە ئەوە ـ عیزرائیلە لەو هەرێمە و مردن زۆر دەبێ. مردنی قەساب لە هەرێمێک لاچوونی دەردوو نەخۆشی یە.

قیر:

بەدەست کەوتنی. مارە کردنی ژنێکی نابەدڵە. کەسێ لای وابوو جلکی

بە قیر بووە ئەوە تەڵاقی ژنەکەی کەوتووە. خواردنی قیر کردنی کاری بەسوودو نابەدڵە.

**قۆچ: شاخ:**

کەسێ لای وابوو لە خەودا قۆچی هەیە ئەوە دەوڵەمەند دەبێ بەڵام ژنو خۆشکی کاری ناڕەوا دەکەنو دەنگ ناکات. شکانی قۆچ تووشی بوونی هەژاریە.

**قوفڵ: ئاچەر:**

دەست کەوتنی قوفڵ لە خەودا دەست کەوتنی ژنێکی ئارامو کابانە. کردنەوەی قوفڵ بە کلیلە ڕزگاری‌یە لە غەم شکانو شکاندنی قوفڵ ئاشکرا کردنی نهێنی برادەرانە:

**قەپان:**

قەپان کردنی شت لە خەودا ڕاوێژ کردنە بۆ چاکە کردنی دەست کەوتنی قەپان هاوبەشی کردنە لە گەڵ کەسێکی ئەمێن بۆ مرعامەلە کردن. شکانی قەپان زۆر بوونی حیلەو حەواڵەی لە بێوانو کێشان:

**قاورمە: قەریە:**

بنواڕە گۆشت.

**قەلەن:**

درووست کردنی قەلەنو توتن کێشان بە قەلەن سەرف کردنی ماڵە لە

شتی بێسوود.

**قیمه:**

بنواڕه گوشت:

**قاوەڵتی:**

کـردنی بـه خـواردنـی بـاش وەک شیر. هەنگوین. هێلکه ئەوە دەوڵەمەندی‌یه هەروەها تەمەن درێژی‌یه.

**قــاز:**

خواردنی گوشتی و گرتنی قـاز دڵداری‌یه له گـەڵ ژنێکی نـەناسراو. فیرەی قاز له بەر دەرگا. تووش بوونی خاوەن دەرگـایه بـه بـەڵای گـەورە هێلکەی قاز خواردنی بەدەست کەوتنی پارەیه قـسه کردنی قاز له گەڵ هەر کەسێک سـەفەر کردنی دوورە:

**قەتێ: کورکورە**

گرتنو گۆشت خواردنی جێ‌بەجێ بوونی ئیشی کابرایه فڕینی قەتی لاچوونی غەمه.

**قوڵینگ: سی‌ی:**

گرتنی له خەودا دۆستایەتی خەڵکی بێ‌گانەیه. سوار بـوونی سـەفەر کردنه: هەڵ گرتنی تورکی هەژاری‌یه. گوێ گرتن له دەنگی ڕزگاری‌یه له غەم:

قەلە بەرخۆڵە:

هاتنی قەلە بەرخۆڵە بە زۆری بۆ وڵاتێک هاتنی عەسکەرێکی زۆرداره بۆ وڵاتە کە کوشتنەوەی قەلە بەرخۆڵە زیناکردنە.. شاردنەوەی بە دواکەوتنی هەوای دونیایە.

قەرەباچکە:

گرتنی لە خەودا مارە کردنی بێوەژنە. خواردنی گۆشتی دڵداری کردنە لە گەڵ ژنێک کە ئابڕووی پێ دەچێ.

قەلەڕەش:

گرتنی لە خەودا برادەرایەتی کەسێکی دەروون پیسە: نیشتنەوەی قەلەڕەش لە سەر بانی کەسێک یان لە سەر بەدەنی ئەوە کەسێک بە خەبانەت هاتوڕچۆی دەکات دەیەوی حەز لە ژنی بکات نیشتنەوەی قەلەڕەش لە بەردەرگەی کەسێک ئەو کەسە تووشی گوناحێکی گەورە دەبێ. کوشتنەوەو گۆشت خواردنی قەلەڕەش لە خەودا دەست کەوتنی ماڵی حەرامە لە لایان پاشاوە.

قابیل:

دیتنی قابیل کوڕی ئادەم لە خەودا تاوان کردنە.

قیامەت: پەسلان:

دیتنی لە خەودا سەفەر کردنی دوورە. ئەگەر وابوو خەڵک بۆ مەیدانی حەشر دەچێت پێویستە ئەو کەسە تۆبە بکات لە گوناحکردن کەسێ لای وابو حیسابی قیامەتی بە سووکی لە گەڵ کرا ئەوە لە ناو ماڵ و منداڵی

خۆی بە خۆشی دەژی: ئەگەر لای وابوو مردوان لە ناو گۆڕ دێنە دەری و دەچن بۆ مەیدانی حەشەر ئەوە لەو هەرێمە داپەروەری بڵاو دەبێت وە کەسێ لای وابوو لە سەر پردی سیرات بە ئاسانی پەڕییەوە یان دەفتەری ...م دەوەی بەدەستی راستی درایەو وەرگرت ئەوە موژدەیە بە چوونی بەهەشت بەڵام وەرگرتنی دەفتەری کردەوە بە دەستی چەپ مردنە بە بێ ئیمانی بەهۆی بیرو بڕوای پڕو پوچ.

قەبر: گۆڕ:

هەڵ قەندنی قەبر لە خەودا ژن هێنانە: پڕ کردنەوەی تەمەن درێژییە: هەڵ نانی درروست کردنی خانووە. چوونی ناو قەبر حەپس بوونە. کەسێ لای وابوو کفن کراوو چووە ناو گوڕ ئەوە ژنێک بەدرزو دەلەسە مارە دەکات کەسێ لای وابوو قەبری کەسێک هەڵ دەداتەوە بە دوای رەووشتی ئەو کەسە دەکەوێ.

قنوت:

قنوت خوێندن لە نوێژدا پتەوی ئیمانە بە خوا بەڵام لە غەیری نوێژ قەبوڵ بوونی دوعایە لای خوا.

قاپ: ئامان: سینیە:

بەدەست کەوتنی قاپی زێڕ ناوبانگ دەرکردنە بە دەوڵەمەندی هی زیو ... ـنی ژنێکی کابانە یان خۆی یان خزمی: یان پەیدا بوونی کچێکی باشە: ... گڵ دەست کەوتنی ماڵێکی کەمە: دەست کەوتنی قاپی شووشە خوێندنی قورانی مەزنە. شکانی قاپو ـ ژەنگداری. پەیدا بوونی ئاژاوەی

ناو ماڵە بۆ خاوەن قاپەکە بەهۆی پرتەو بۆڵەی ژنی چەنەباز.

قەفەز:

کردنی قەفەز لە خەوداکۆ بوونەوەی ئیشو و کاری ئاڵۆزە لە سەر شانی قەفەزکەر. بەڵام بۆ بێ‌ژن ژن هێنانی بە زەحمەتە.

قۆلنج:

ئەگەر ژنێکی ئاووس لای وابوو تووشی دەردی قۆلنج بوو ئەوە منداڵێکی دەردەدار دەبێ. ئەگەر کچێ لای وابوو تووش بوو ئەوە قسەی دڵ تەزێنو ناڵەبار بەرانبەر باوکی دەکات. ئەگەر ـ پیاوێ تووش بوو ئەوە ڕەزیلی دەکات بۆ سەرفی کردنی ماڵ لە ژیانی خێزانی خۆیدا:

قاپ قاپ:

لە پێ کردنی قاپ قاپی دار لە خەودا دیندارییە. بەڵام هی زێڕوو هێ زیوو ئاسن ڕیابازییە لە دینداریدا:

قەرد: وام: قەرز

کەسێک لای وابوو پارە بەقەرد دەدا بە خەڵک ئەوە فەرمانی خوا جێبەجێ دەکات. قەرد کردنی بۆ شتی باش دینداریە بەڵام بۆ شتی خەراب تاوان کردنە.

قاوێت: پۆخین:

خواردنی لە خەودا هەڵ خەڵەتانە بۆ کردنی شتی ناڵەبار بە قسەی

هەندێ کەسێ ناڕەسەنو حیلەباز.

**قیرەقیڕ:**

کەسێ لە خەودا لای وابوو لە جێگایێک قیرەقیڕ پەیدا بوو ئەوە شتێ ڕوو دەدات کە غەمی بێ دەخوات.

**قاشویان: شەقینە:**

کەسێک لای وابوو لە گوزرە پانێک دووکوزمەڵ شەقینە دەکەن ئەوە پاشای وولات دەمرێ.

**قشلاغ:**

سوروتانی قشلاغ پەیدا بوونی مردنی زۆرە لە هەرێمەکە بەهۆی دەردەوە. چوونە ناو قشلاغ تووش بوونی ڕقەبەرەی‌یە لە گەڵ کاربەدەستانی میری. لەوەڕاندنی ئاژەڵ لە قشلاغ تووش بوونی خەون بینەکەیە بە دەردەسەری بەهۆی خزمی نالەبار.

**قرنی: مێشە بزنە:**

کەسێک لە خەودا لای وابوو مێشە بزنە لە هەرێمێک زۆر بوو ئەوە هەرزانی دەغلوو دانە لەو هەرێمە. کوشتنی مێشە بزنە دەوڵەمەندی‌یە. هاتنە ناو ماڵی هەر کەسێک هەژاری‌یە.

**قاڵوچە:**

کەسێ لای وابوو قاڵوچەی بۆلا دەهات ئەوە ماڵی دونیای زۆر دەبێ

گرتنی قاڵوچە پەشیمانی یە لە کردنی کاری سووک. دیتنی قاڵوچە لە ناو ماڵ دۆستایەتی ناکەسانە. خواردنی قاڵوچە لە خەودا سەرف کردنی ماڵە بە بێ سوود:

قەنەفل:

بۆن کردنی لە خەودا بڵاو بوونەوەی ناوبانگی چاکەیە. بەڵام خواردنی لە خەودا تووش بوونی غەمو دەردە:

قەیسی: زەردەڵو:

کەسێ لای وابوو قەیسی خوارد ئەگەر کاتی قەیسی بوو ئەوە دەست کەوتنی پارەیە ئەگەرنا تووش بوونی نەخۆشی یە. چاندنی نەمامی قەیسی تووش بوونی نەخۆشی یە لە بەر ماندوو بوون: دانیشتنی لە بن داری قەیسی برادەرایەتی کەسێکی دەردەدارە.

قەسەڵ:

کۆ کردنەوەی قەسەڵ لە خەودا بۆ مەلا لادانە لە ڕێی ئایین بۆ بازرگان تووشی زیانە. بەڵام بۆ جووتیار بەدەست کەوتنی دەرامەتی زۆرە لە کشتو کاڵ:

قوڕ بوون:

کەسێ لای وابوو قوڕ بووە. پێویستە ئەو کارە کە خەریکە بیکات وازی لێ بهێنێ دەناتێدا دەچی.

قدیله: خرتکه:

ئەگەر لای وابوو کەسێک قدیلەی کردەوە ئەوە کەسێکە کە خەریکە کاروباری لێ تێک بدات بە مەرجی کابرا بناسێ ئەگەر نەیناسێ ئەوە ژنی خۆیەتی دەیەوێ دڵداری لەگەڵ بکات یان کوڕی خۆیەتی دەیەوێ زیانی لێ بدات.

قامیش:

دیتنی قامیشی شەکر مارە کردنی ژنێکە کە زۆر ئارامو ڕەسەنە بەڵام ئەگەر هی شەکر نەبوو ئەوە ژنێکی حۆلو چەنەبازە.

قوندەیی:

کەسێک لای وابوو ئاژەڵێکی قوندەی هەیە ئەوە ئەولادی بێسوودو وێڵو کەم دینی هەنە و چاریان ناکرێ:

قرژاڵ:

گرتنی لە خەودا سەفەر کردنە لە ناو دەریادا ڕام کردنی ئامۆژگاری کەسێکی زۆردارە کە بە قسەی دەکات گۆشت خواردنی بە دەست کەوتنی ماڵی دونیایە بەهۆی بازرگانی.

قەتران:

خواردنو. کڕینو. بەدەست کەوتنی. موعامەلە کردنە لە ماڵی قاچاغ ئەگەر واز نەهێنی لە ناو دەچێ:

قەزوان:

خواردنی لە خەودا سەفەرێکی دوور دەیکات. سەرکەوتنی داری قەزوان مارە کردنی ژنێکی بێگانەیە بڕینی داری قەزوان ژن هێنانە بۆ خزمێکی خۆی.

قۆزی:

کەسێک لای وابوو لە خەودا زۆر قۆزە ئەوە بە سەر دووژمندا زاڵ دەبێ. دیتنی ژنی قۆز لە خەودا ساڵێکی خۆش و بەدەرامەتە.

قەشە:

دیتنی و دەست ماچکردنی قەسە لە گەڵ کردنی بە دوا کەوتنی شتی دژی ئیسلامە کەسێ لای وابوو بووبێتە قەشە ئەوە دبێتە سەرۆکی کۆمەڵێکی دژی ئایینی ئیسلام.

قادرمە: پێ پلکە: نەردیوان: پەیژە:

بە سەرکەوتنی قادرمە بۆ جێگایێکی ئەگەر دار بوو ئەوە دینداری‌یە. ئەگەر بەرد بوو دڵ ڕەقی‌یە. ئەگەر خشتی سوور وەکرابوو ئەوە تۆبە کردنە لە گوناحان. بە سەرکەوتنو هاتنە خواری قادرمە جێ‌بەجێ کردنی ئیشی کۆمەڵە شکانی لە بن پێدا لە دەست چوونی پایەیە ـ بە سەرکەوتنی پەیژە بۆ دوایی پەیژەکە مردنی کابرایە. جوانی نەردیوان شادی خاوەنەکەیەتی:

# « پیتی کاف »

**کەوسەر:**

خواردنەوەی ئاوی کەوسەر لە خەودا جێبەجێ کردنی فەرمانی خوایە: خۆ شوشتنی بە ئاوی کەوسەر تۆبە کردنە لە گوناحان و تەڵاقدانی ژنی خۆیەتی بە هۆی کەم دینی و مارە کردنی ژنێکی دیندارە.

**کابە: کەعبە: قیبلە:**

چوونی ناو کابە دڵ خۆشی و دینداری یە ڕووخانی کابە مردنی پاشای وڵاتە ـ دزی کردن لە شتی بکا زینا کردنە لە گەڵ دایکی خۆی. نوێژ کردن لە ناو کابە مردنە بە شەهیدی کەسێ لای وابوو نوێژ دەکات ڕوو بە کابە ئەوە فەرمانی قورآنی جێبەجێ دەکات: نوێژ کردن لە سەر بانی کەعبە بەرز بوونی دینی ئیسلامەتی یە کەسێ لای وابوو لە ناو کابە دەست نوێژی شکا ئەوە پاشای وڵات تووشی بەڵا دەبێ. کەسێ لای وابوو کابەی لێ گوڕاوە ئەوە بە دووای شتی دژی ئیسلامەتی دەکەوێ. کەسێ لای وابوو ماڵی ئەو بووتە کابە ئەوە ژنێکی دینداری هەیە کەسێ لای وابوو کابە تێک چووە ئەوە ئەو کەسە نوێژ ناکات.

**کتێب:**

دەست کەوتنی کتێبی بەرگ جوان شادی یەو نووسینەوەی کتێب بە

دەستی چەپ غەم و خەفەتە. هەڵ گرتنی کتێب غەمباری بە نووسینەوەی کتێب بە خەتی ناشیرین کردنی کرداری نارەوایە. دڕاندنی کتێب غەم لاچوونە دیتنی کتێبی لول دراوە نزیک بوونەوەی مردنی کابرایە کەسێ لای وابوو نەیدەزانی کتێب بخوێنێتەوە ئەوە فێڵ لە خەڵک دەکات بۆ ماڵی دونیا دیتنی نووسەر لە خەودا کەسێکی حیلە بازە.

**کەڵەباب: کەرەباب: کەڵەشێر: دیقل:**

بەدەست کەوتنی کەڵەباب برادەرایەتی پیاوی دیندارە کە سوودی هەیە بۆی کوشتنەوەی کەڵەباب وەڵام نەدانەوەی بانگی نوێژە کەسێ لای وابوو بووبوو بە کەڵەباب ئەوە زوو دەمرێ ئەگەر لای وابوو کەڵەباب دوو جار دەنووکی لێ دا ئەوە بە دەستی کەسێک دەکوژرێ. شەڕە کەڵەباب شەڕ کردنی دوو پاشایە کە زۆر کەس لە ناودەبا کەسێ لای وابوو کەڵەباب لە ماڵەکەیدا دەنکە گەنم دەخوات ئەوە دز بە ماڵی فێر دەبێ و دزی لێدەکات.

**کورتان:**

درووست کردنی کورتان لە خەودا قەرد دانەوەیە. بەدەست کەوتنی کورتانی نارێک مارە کردنی ژنێکی نالەبارە.

**کۆچکە:**

لە سەرنانی بۆ پیاوان تووش بوونی دەردەسەرییە. بۆ ژنان شادی بەختەوەرییە:

**کێک:**

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنەوەی ماڵی لە دەست چووە بە ئاسانی.

کافور:

دەست کەوتنی لە خەودا ئامۆژگاری کردنی خەلکە بۆ چاکە کردن.

کەفارەت:

کەسێ لای وابوو کە فارەتیدا لەبری سوێند خواردنی یان لەبری خواردنی ڕۆژووی ڕەمەزان ئەوە قەردی خەڵک دادەتەوە..

کاهین:

کەسێ لای وابوو بووبوو بە کاهین ئەو تووشی خێرو خۆشی دەبێ.

کوڵ کردن:

کوڵ کردن بە ئاوی گەرم حەج کردنە. بەلام بە ئاوی سارد غەمە:

کەر: گوێ درێژ:

بەدەست کەوتنی ماکەر لە خەوردا دەوڵەمەندییە کەرگان یان سوار بوونی گەیشتنە بە ئارات زۆر بە ئاسانی. ئازوانی کەر خێر کردنە بە هەژاران شەڕ کردن لە گەڵ کەر دووبەرەکییە لە گەڵ خزمی خۆی: هەبوونی زۆرکەر: خزمی سادەو بێهۆشن. هەڵ گرتنی کەر بێ دەستەڵاتییە خەڕ کردنەوەی تەرسی کەر دەست کەوتنی ماڵی دونیایە کەسێ لای وابوو کەر گای ئەوە پایەی بەرز دەبێ. لاوازی کەر هەژاری خاوەنەکەیەتی بردنەوەی کەر بۆ ماڵ دەست کەوتنی خێرو خۆشییە. بەر بوونەوە لە کەر لە دەست چوونی پایەی خاوەنیتی: بوونی کەر بە هێستر شادیو خۆشی خاوەنیتی ئەگەر کەر لە ماڵی کەسێک بزێت ئەو کەسە دەوڵەمەند دەبێ بوونی کەر بە

ماین ژن هێنانی خاوەنیتی. خواردنی شیر و گۆشتی کەر تووش بوونی دەردو و نەخۆشی یە. کەسێ لای وابوو بووبوو بە کەر ئەوە تووشی بەلا دەبێ ئەگەر لای وابوو کەرەکەی جاشکی هەیە ئەوە کوڕێکی باشی دەبێ. مردنی کەر لە دەست چوونی پایەو ماڵی خاوەنیتی دەنگی نرخ گرانی بوونی دەغلودانە کەسێک لای وابوو کەرەکەی فڕی ماڵێکی زۆری لە دەست دەچێ قسە کردنی کەر لە گەڵ هەر کەسێک دین پتەوی کابرایە.

کەنیشتە: کلێسا:

چوونە ناوی بۆ بێ ژن ژن هێنانە بۆ بێ ماڵ ماڵی دونیایە بۆ دیندار کەم کردنەوەی بە جێ هێنانی فەرمانی دینە ڕازاندنەوەی کلێسا لە خەودا نزمی ئایینی ئیسلامە ڕووخانو سووتانی بەرزی ئایینی ئیسلامە.

کافر: گاور:

کافر بوون لە خەودا مردنی بێ ئیمانە دیتنی ژنێکی کافر تووش بوونی دەردەسەری یە بەڵام بۆ جوتیار دەرامەتی زۆری شیاوی یە.

کورسی:

دانیشتنی لە سەر کورسی دار گەیشتنە بە ئاوات لە سەر هی زێڕ پایەی مەزنە لە سەر هی زیو دەوڵەمەندی یە.

کل: سورمە:

لە چاو کردنی سورمە لە خەوداگرتنی ڕێبازی پێغەمبەرە(د.خ) لە چاو کردنی کل بۆ کچ مێرد کردنە بۆ کوڕ ژن هێنانە. ئەگەر بێوەژنێک یان پیاوێک

شتێکی پیس کرده چاوی ئەوە مارە کردنی ژنێکە کە بە فەرموودەی شەریعەت مارەیی نایەت.

کێل: قێل:

دیتنی کێلی قەبر لە خەودا بە چەقاوی ئامۆژگاری کردنە بە چاکە بۆ خەڵک. نەخشاندنی کێل بە دواکەوتنی شتی پیسووده.

خەڵک: شووتکە:

کەمەرە بەستن لە پشت بۆ کچ مێرد کردنە بەڵام بۆ پیاو تووش بوونی غەمە.

کاولەخانوو: کەلاوە:

چوونە ناوی لە خەودا مارە کردنی بێوەژنە: چاک کردنەوەی لە خەودا بە دوواکەوتنی کاری بێسوودە:

کاروان:

هاتنی کاروان هەرچی هەبێ بۆ وڵاتێ هەرزانیو خۆشییە. ڕۆیشتن لە گەڵ کاروان گەشتنە بە مەبەست:

کەسکوو سوور کۆلکەزێڕینە:

دیتنی بە ڕەنگی سوورەوە کوشتنی کابرایە لە لایەن دووژمنەوە. بە ڕەنگی سەوز هەرزانی نرخی خواردەمەنییە.

کەندوو:

درووست کردنی کەندوو پاشە کەوت کردنی پارەیە کەبەس ژنەکەی سوودی لێ وەردەگرێ. شکانی کەندوو بڵاو بوونەوەی نهێنی خاوەنەکەیەتی.

کەنداو:

ئەگەر کەسێک لای وابوو لە کەنداوی عارەبە ئەوە مەڕوو ماڵانی زۆر دەبێ ئەگەر لای وابوو لە کەنداوێکە نازانی کۆیە ئەوە ئیشی دەکات بە دژی یاساکە تووشی سزا دەبێ.

کوڕادە:

خواردنی لە خەودا لادانە لە ڕەوروشتی پێغەمبەر(د.خ).

کەرکەدەن:

سوار بوونی زاڵ بوونە بە سەر ناحەزاندا: کوشتنی دەست کەوتنی پلەی بەرزە شەڕ لەگەڵ کردنی بەرانبەری شەر کردنی کەسێکە کە لە خۆت بەهێزترە. خواردنی گۆشتی دەست کەوتنی ماڵی حەرامە:

کـــراس:

لە بەر کردنی کراسی جوان بۆ بێ ژن ژن هێنانە بۆ ژندار شادییە پێنە کردنی کراس جیا بوونەوەیە لە ژنی خۆی. دڕانی کراس ئاژاوەیە بەهۆی ژنی حۆلی بە هەراش سووتانی کراس ژن تەڵاقدانە پۆشینی کراس سەوز وسپی مردنە بە شەهیدی هی زەرد دینداریە پۆشینی کراسی کۆن مارە

کردنی ژنی خاوەن منالە.

**کورەی ئاگر:**

کەسێ لای وابوو کورەی ئاگر خۆش دەکات ئەوە دوو زمانی دەکات لە ناو خەڵک.

**کاریلە: کارژۆلە:**

دە[illegible]تنی لە خەودا. دەوڵەمەندی‌یە. کوشتنەوەی لە خەودا [illegible]ەیشتنە بە ئاوات قەڵەوی کاریلە پایەی بەرزی خاوەنەکەیەتی. لاوازی بێ‌هێزی‌یە بۆ خاوەنەکەی مردنی کاریلە لە دەست چوونی پایەی خاوەنەکەیەتی.

**کۆخە: کۆلە: کۆکین:**

بە توندی نیشانەی نزیکی مردنە: هەروەها ئەگەر کەسێک ویستی بکۆکی‌و نەیتوانی نیشانەی مردنی کابرایە ئەگەر کوکە بەڵغەمی لە گەڵ بوو ئەوە شادی‌و خۆشی‌یە. کوکینی توند کەخوێنی لە گەڵ بێ گوناح کردنە.

**کوێن:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا جێ‌بەجێ بوونی کاری خاوەنەکەیەتی بەهێزی کەسێکی هێزدار: شکاندنی بەربەکوێن مردنی کەسێکە لە هەرێمەکە.

**کەپر:**

بڕوانە سابات.

کفنە:

خـواردنـی لە خـەودا مـوژدەی شـادی‌یە: ژنـێک لای وابـوو کـفـنەی درووست کرد بۆ خواردن ئەوە لای مێردی خۆشەویست دەبێ:

کدو: کولەکە:

خواردنی لە خەودا هـەر جـۆرێ هـەبێت خـێرو خـۆشـی‌یە لە ژیـانـدا چاندنی کولەکە بە دواکەوتنی ڕێبازی دیندارانە:

کەوگیر: کوپە:

هەڵ گرتنی بە دەست لە خەودا تووش بوونی دەردی لەرزووکی‌یە

کوپـــە:

دیتنی کوپەی شـەراب دزی کردنی خاوەنەکەیەتی: هی پڕ ئاو دڵپاکی خاوەنەکەیەتی. جوانی کوپە بەرزی خاوەنێتی. شکانی هەژاری‌یە.

کلک:

درێژ بوونی کلکی هەر ئاژەڵێک گران بوونی نرخیەتی کـورت بـوونی هەرزانی‌یە گرتنی کلکی ئاژەڵ داواکردنی کارێکی خۆیەتی کە بۆی ئەنجام بدرێت لە لایەن کەسێکی ڕاست گۆ: ئەگەر کەسێک لای وابوو کلکی هەیە ئەوە کارێ دەکا ئابڕووی دەچێ لە ناو کۆمەڵ:

کـــەو:

گرتنی کەو لە خەودا بۆ کەسێک بێ ژن ژن هێنانە. ماڵی کردنی کەو فێر

بوونی قورآنی پیرۆزه. گۆشت خواردنی کەو بەرگی نوێ لە بەر کردنە خوێندن کەو لە کێو نیشانەی ساڵی خۆشە بەڵام لە گوند ئەوە پەیدا بوونی یاوی دیندار‌ی سوود بەخشە.

کۆتر:

بەدەست کەوتنی لە خەودا ماڵی حەڵاڵە. بەرد گرتنە کۆتر بوختان کردنە بە ژنی بێ تاوان. هەبوونی کوتری زۆر لە لای کەسێک سەرزکایەتی کەسەکەیە بۆ کۆمەڵێک کە حەزی پێ ناکەن گرتنی کۆتری سپی شادییە. هی ڕەش فێر بوونی پیشەسازییە فڕینی کۆتر لە ماڵ تەڵاقدانی ژنی خاوەن ماڵە یاری کردن بە کۆتر: کردنی کاری بێ سوودە بڵاو کردنەوەی دانەوێڵە بۆ کۆتر گرتنی حیلەبازییە لە خەڵک. گرتنی فەرخەی کۆتر پەیدا بوونی منداڵە یان بۆ خۆی یان بۆ خزمێکی.

کۆلارە:

گرتنی کۆلارە لە خەودا تەماع کردنە لە ژنێکی بێ وێڵ، خوێندنی کولارە لە هەرێمێ زۆر بوونی زینایە لەو هەرێمە. فڕینی کۆلارە لە دەست کەسێک سەرف کردنی ماڵە بە بێ سوود.. خواردنی گۆشتی کۆلارە ماڵی حەرامە:
کەڵک: پاسارە یاماسی خوار

کوشتنی کەڵک لە خەودا تەڵاقدانی ژنێکی چەنەبازە خواردنی گۆشتی لە خەودا تووش بوونی غەم و دەردە بە هۆی کەسو کاری ناپەسند. گرتنی کەڵک لە خەودا دڵدارییە لە گەڵ ژنێک کە ئەو پەڕی جوانە. بەڵام ئەو پەڕی بێ هۆشە.

کوندەبەبو:

دیتنی لە خەودا لە هەرنمێک: چۆڵ بوونی هەرنمە کە بە گرتنی و گۆشت خواردنی غەم و دەردە. کوشتنی لاچوونی غەمە.

کوزەڵە:

خواردنی لە خەودا ژیانی شادییە.

کلیل:

کەسێک لای وابوو کلیلەی داری بە دەستەوەیە ئەوە ئەسپاردەیە ولای کەسێک دانیاوەو ئەویش نایداتەوە کلیلەی بێ ددانە بەدەست کەوتنی خواردنی ماڵی هەتیوانە. کەسێ لای وابوو کلیلەی بەهەشتی لایە ئەوە بە شادی دەژی. کەسێک لای وابوو قوفڵی کردەوە بە کلیلە ئەوە ئیشی خەڵک جێبەجێ دەکات. ژنێ لای وابوو کلیلەی درایە ئەوە مێرد دەکات.

کوتەک: تۆپز:

لە خەودا تۆپز بە دەستەوە گرتن مەیل کردنە بۆ زۆرداری کردن لە خەڵک بەلام دەستەلاتی نابێت.

کارتیغ: برپەند:

کەسێ لای وابوو برپەندی پێیە ئەوە بە زمانی شیرین ئیشی خۆی جێبەجێ دەکات لای خەڵک: ئیش کردن بە کار تیغ دانانی ماڵە بۆ کوڕی.

کونکەر درەوشە:

کەسێ لای وابوو درەوشەی هەیە ئەوە خێر دەکات بە هەژاران. ئەگەر

لای رابور کون کەرەکەی شکا ئەوە تۆشی هەزاری دەبێ:

**کلۆ: کولە:**

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵی بێ ماندوو بوونە. هاتنی بۆ وولاتێ ئەگەر زیانی نەبێ خێرو بەرەکەتە بەڵام ئەگەر زیان بەخش بوو ئەوە عەسکەری پاشاییکی زۆردارە. کۆکردنەوەی کولە: پاشەکەوت کردنی ماڵە بۆ ژن هێنان:

**کیـــەڵ:**

دیـتنی لە خـــەودا بـرادەرایـەتی پیاوانـی ئـایـنی‌یـە کـە سـوودیان لێ وەردەگـرێ زۆر بـروونی کـیـــەڵ لە هـەرێمێک زۆر بـروونی دیـنداری‌یـە خواردنی گۆشتی زانیاری‌و چاکە کردنە. کوشتنی لە خەودا گوناح کردنە:

**کێچ:**

کەسێ لای رابور کێچ گەستی ئەوە پیاوێکی ناکەس دەیەوێت زیانی لێ بدات. کوشتنی لە خەودا زاڵ بوونە بەسەر ناحەزدا.

**کوندە:**

بنوارە جەوەندە:

**کـــون:**

چوونە ناو کون لە خەودا گوناح کردنە. گرتنی کون تۆبە کردنە لە گوناح.

کرم:

خواردنی کرم لە خەودا تووش بوونی مالی حەرامە. هاتنە دەری کرم لە زار منداڵی خۆیەتی دەیەوێ حیلەی لێ بکات. کەسێ لای وابوو کرمی زۆر کەوتە سەر بەدەنی بەڵام ئازاری نەبوو ئەوە ئیمانی بە خوای گەورە زۆر بەهێز دەبێ. بەڵام ئەگەر ئازاری هەبوو ئەوە ئەو کەسە لایداوە لە فەرمانی خوا.

کالان: کیف:

کالانی خەنجەرو شمشێرو کیفی دەمانچە ئەگەر لە خەودا بە جوانی کەوتە دەستی ئەوە مارەکردنی ژنێکی دیندارو ئارامە بەڵام بەشکاوی و ناشیرینی زیانی غەمباریو تەڵاقدانی ژنەکەیەتی.

کەڕی:

کەڕ بوون لە خەودا کردنی گوناحی زۆرە چاکبوونە وە تۆبە کردنە.

کارگەی جوجەڵە:

دروست کردنی کارگەی جوجەڵە لە خەودا منداڵی زۆرە بۆ خاوەن ژن. وەبۆ هەژاران دەوڵەمەندیە بەماڵی حەڵاڵ.

کتێب بەرگ کەر:

کەسێ لای وابوو بووبە کتێب بەرگ کەر ئەوە دەبێتە مردوو شۆڕ و سوردی قیامەتی دەست دەکەوێ.

**کیلون: قفل**

کەسێ لای وابوو دەرگەی بەکیلونی هەیە ئەوە ژنێکی کابان مارە دەکات یان خۆی یان خزمێکی. شکانی کیلون. مردنی ژنی خاوەنیتی بزر کردنی کیلون حواردنی شیربایی‌یە.

**کلدان:**

کەسێکی لای وابوو کلدانی کەوتە دەست وکلی تێدایە ئەوە دینداری بە هێز دەبێ.

**کەرویشک: کویریشک:**

گرتنی لە خەودا مارەکردنی ژنێکی بێ‌هۆشە خواردنی گۆشتی دەست کەوتنی ماڵێکی کەمە. گرتنی بە تاژی شیربایی خواردنە.

**کەرموزە: مێشەکەرە:**

زۆر بوونی کەرموزە لە وڵاتێک: تووش بوونی خەڵکە کەبە بۆ دەردو نەخۆشی. کوشتنی مێشەکرە لە خەودا لاچوونی غەمە.

**کەتیرە: جەوی:**

کردنی لە خەودا کاسبی کردنی حەڵاڵە. خواردنی لە خەودا قازانجێکی زۆرە کە لە پیشەسازی دەستی دەکەوێ.

**کانیاو:**

دیتنی بەڕوونی ژیانی شادی‌یە. بەڵام بە لێلی تووش بوونی غەم و دەردە. هەڵ قوڵینی کانیاو لە ناو ماڵ خێرو خۆشی‌یە.

کــزن:

خواردنو چاندنی لە خەودا پارمەتی دانی زۆردارانە.

کــوری:

کەسێک لای وابوو پشتی کوڕ بووە لە خەودا ئەوە تووش بوونی خەمە بە هزی مندالی خۆی.

کـــور:

کەسێ لای وابوو لە خەودا کورپی بووە ئەوە پایەی بەرزی دەست دەکەوێ. مردنی کوڕ لە دەست چوونی زەوی و زارە.

کــچ:

ژنێک لای وابوو کچی بووە ئەوە هەوێی بە سەر دێت.. مردنی کچ لە دەست چوونی ماڵە بەهزی قومار کردن...

کەلەکە: تەنکێشە:

هێشان و شکانی غەمو خەفەتە کە بە هزی خزمی خۆی تووش دەبێ

کێم: زوخاو:

خواردنی زوخاو زەکات نەدانە. کەسێ لای وابوو کێم لە بەدەنی دێت ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبێ.

کفن: خەڵات:

کفن کردنە بەر لە خەودا ئەگەر کفنی تەواو بوو ئەوە مردنە بە شەهیدی

بەڵام نانەواو بوو ئەوە زینا کردنە: کفنی مردوو ئەگەر جوان بوو ئەوە مردووە کە لە بەهەشتە:

کەفتیار: کەمتیار:

گرتنی لە خەودا مارە کردنی ژنێکی هەڵەوەڕە. گۆشت خواردنی مانای وایە کەسێک بە ناوی دۆستایەتی دەیەوێت فێڵی لێ بکاتو نازانی بەر فێڵبازە سوار بوونیو گاینی کەمتیار دەست کەوتنی پایەی بەرزە ئەگەر کەسێک تفنگ یان بەردی لە کەمتیار دادا ئەوە بوختان بە ژنێک دەکات کە ژنە کە پاکە:

کوارگ: قارچک:

حواردنی لە خەودا بۆ دەوڵەمەند هەژارییە. بۆ هەژار دەوڵەمەندییە بۆ نەخۆش چاکبوونەوەیە. بۆ لەش ساغ نەخۆشییە:

کەوەت: داری جەنگەلی

دیتنی داری کەوەت دینداریە. برینی داری کەوەت لادانە لە فەرمانی خوا بە هۆی برادەری کەم دین چوونی سەرداری کەوەت گرتنی ڕێی دینداریە.

کەوا:

لە بەر کردنی کەوای جوان دینداریەو پایەی بەرزە سووتانی کەوار درانی تووش بوونی هەژاری و بێدەستەڵاتی خاوەنێتی. ئەگەر لای وابوو کەسێ کەوای دایە ئەوە لە خزمی خۆی ژنێکی دەداتێ.

کیسە: جزرک:

هەڵ گرتنی کیسە هەرچێکی هەبێ ئاگاداری کردنی ئەسپاردەی خەڵکە درانی جزرک خەیانەت کردنە بە ئەسپاردەی خەڵک...

کولاو کڵاو:

لە سەر نانی کڵاو لە خەودا پەیدا بوونی ڕێزە بەلام لە سەر لابردنی بێ ڕێزی یە ڕفاندنی کڵاو لە سەری کەسێک کردنی کارێکە لە لایەن ئەو کەسەی لێ ی ڕفاوە کە ئابڕووی پێ دەچێ. کڵاوی تەنگ ئازاردانی باوکی خزیەتی لە لای خزیەوە. هی فراوان خزمەت کردنی باوکە بەرز بوونو و درانی کڵاو کردنی کاری بێ ئابڕووانەیە...

کەڵەک: بەلەم: قایغ

سوار بوونی بەلەمو کەڵەک لە ناو ئاودا بە دوا کەوتنی کارێکی زۆر ئاستەمە بەڵام بەهزی کەسێکی بەهێز بزی جێبەجێ دەبێ نقووم بوونی کەڵەک لە دەست چوونی پلەی بەرزی خاوەنیتی:

کاردی:

چاندنی درووست کردنی ئازاوەی ناوماڵە هەڵ قەندنی بەرگری کردنە لە ئاژاوە خواردنی قوت دانەوەی رقە بەرانبەر ژنە چەنە بازەکەی.

کەف:

دیتنی کەفی سابوون لە سەر جل و بەدەن دڵپاکی یە بەرانبەر بە خەڵک. دیتنی کەفی ئاو بەرگری کردنە لە لایان میری لە کردنی کاری دزی یاسا بە توندی.

**کاکوڵ: پەرچەم: پرچ: کەزی: بسک: قژ:**

جوانیو ڕەشی ناوبراوان بۆ ژن بەختیاریو ڕەووشتی مەزنە بەڵام بۆ پیاو بسک هەبوون تورش بوونی غەمە ئەوانی کە هەمووی باشن سپی بوونی قژی ژنی گەنج مردنێتی بە زوویی بەڵام سپی بوونی بۆ پیاوی گەنج دەست کەوتنی پایەی بەرزە درێژ بوونی ناوبراوان زیاتر لە خۆی ژیانی پڕ دەردەسەریە بەڵام بە قەدەر خۆی ژیانی شادیە.

**کونجی: قونجی:**

خواردنی کونجی یان دۆشاوی بەدەست کەوتنی ماڵی حەڵاڵە چاندنی لە خەودا پەیدا بوونی مەڕی زۆرە بو بینەرەکە

**کشپل: پشقل:**

کۆ کردنەوەی لە خەودا کە سابەت کردنێکە کە سوودی کەمە. خواردنی لە خەودا خەفەت خواردنی کەم دەستیە. یان خواردنی ماڵی حەرامە.

**کەوان:**

دەست کەوتنی کەوانی جوان پایەی بەرزەو برادەری باشە یان کوڕی باشە شکانی کەوان مردنی کوڕی یان برای خاوەنەکەیەتی. ئەگەر کەوانی دا بە ژنی خۆی ئەوە ژنەکە کچی دەبێ وە ئەگەر ژن کەوانی دا بە مێردی خۆی ئەوە کوڕی دەبێ ئەگەر کەوانی خواری ڕاست کردەوە ئەوە تەمەن درێژ دەبێ ئەگەر لای وابوو کەسێک کەوانی دایە ئەوە سوودی لێ دەبینی بزر بوونی کەوان مردنی خزمێکی خاوەنیتی ژێ کەوان ئەگەر توندو باش

بوو ئەوە ژنەکەی گوێ ڕایەڵی دەکات ئەگەر ناشیرین بوو ئەوە ژنەکەی لاسارە پیاوی ژێ کەوان تەلاقدانی ژنێتی فرۆشتنی کەوان هەڵ بژاردنی کارێکی پڕوو پووچە بە سەر کارێکی مەزندا. هاویشتنی تیر لە کەوان سەفەر کردنی دوورە:

کا:

کۆکردنەوەی کاو خستنە ناو کەندوو نرخ گران بوونی دەغڵوو دانە بەڵام خستنە ناو کادین هەرزانیە بە خواردنی کا نیش کردنی ناشیرینە لە ناو کۆمەڵ سووتاندنی کا ماڵ سەرف کردنە بە بێ سوود:

کادین:

دروست کردن و سواندنی مێباری کردنە ڕووخانی کادین هەژاری خاوێتی.

کەلەم:

خواردن و چاندنی تووش بوونی غەم و خەفەتە لە لایەن خزم و کەسی خۆی.

کەنگر:

خواردنی بە کاڵی کچ فرۆشتنە بە پارە. پاک کردنەوەی زەکات دانی ماڵە. خواردنی بە کوڵاوی بەدەست کەوتنی ماڵی دونیایە بە زۆری هەڵ قەندنی بەدەست کەوتنی دەرامەتی باشە لە کشت و کاڵ:

کوڵ: تەشت

گوشینی تری و هەناروو قەسب لە ناو کۆلدا نزیک بوونەوەیە لە پاشای

وولات و سوود وەرگرتنە لە کار بەدەستانی میری.

## کەنێر: ناوگوڵە

بۆن کردنی کەنێر لە خەودا بۆ نەخۆش چاکبوونە بۆ بێ ژن ژنهێنانە خواردنی کەنێر دینداری‌یە بە باشی.

## کوشتن:

خۆ کوشتن لە خەودا تۆبە کردنە لە گوناحان بەڵام کوشتنی کەسێک لە خەودا کردنی گوناحێکی گەورەیە. کوشتنی کوڕی خۆی لە خەودا چاکە کردنە لە گەڵی کوشتنی جەردە یارمەتی دانی دینداراانە ئەگەر لای رابور لە خەودا کەسێک کوشتی ئەوە نوێژ ناکات تۆبە بکات باشە: کوشتنی پاشا لە خەودا لە لایان هەر کەسێک پەیدا بوونی ئاژاوەو بێ دادی‌یە لە ناو کۆمەڵدا:

## کەشتی:

سوار بوونی کەشتی ئاسن لە خەودا لە ناو دەریادا کردنی کارێکی ترسناک‌و سامناکە بەڵام هی دار هەر وەک کەڵەکو بەڵەم وایە لە مانای خەوەکەی:

## کەلایان موشێن: هەلماٌتێن

کەسێک لای رابور لە خەودا کەلایانەی دەکرد ئەوە هەرگیز خەرێکی ئیشی منداڵانەیە: دەست کەوتنو درووست کردنی کەلاگرتنی برادەرێکی بێ سوودە:

## « پێتی گاف »

گـا:

کەسێ لای وابوو لەماڵدا گۆشتی گای هەیە ئەوە تووشی هەرزانیو خۆشی دەبێ سوار بوونی گای سپیو ڕەش سەر کردایەتی کۆمەڵێکی کاتی‌یە. سوار بوونی گای سوور مردنی کوڕی سوارەکەیە قەڵەوی لە خەودا ساڵی ـ هەرزانیو بە دەرامەتە لاوازی گا ساڵێکی ووشکو بێ دەرامەتە بۆڕاندنی گا بە سەر کەسێکدا مردنی کەسەکەیە گەستنی گا تووش بوونی غەمە مردنی گاجووت لە جێگایێکی مردنی پیاوێکی ناودارە کەسێ لای وابوو گای سوار بوو ئەوە دەمرێ بە زوویی کەسێ لای وابوو بوو بوو بەگا ئەوە پایەی بڵند دەبێ. بەستەوەی گا لە بەر ماڵ ژیانی خۆشی‌یە بە کار هێنانی پێستی گا بەدەست کەوتنی ماڵی زۆرە.

گاران: گاگەل:

کەسێ لای وابوو بوو بوو بە گاوان ئەوە دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵێکی گوێ لەمست. بۆڕاندنی گاگەل لە هەرێمێک هاتنی بەڵایە بۆ خەڵکی هەرێمەکە: گاوان لە خەودا عالمێکی دینی‌یە مردنی گاوان مردنی عالمێکی بەرزی ئاینی‌یە.

گاسن: گاواسن:

کەسێ لای وابوو گاسنی هەیەو جووتی پێ دەکات ئەوە ڕوو دەکاتە دینداری شکانی گاسن لە خەودا لادانی خاوەنەکەیەتی لە ڕێی دینداری:

گوڵ:

هەڵ گرتنوو بوون کردنی گوڵەباغ بەدەست کەوتنی ژیانی شادییە.. بوون کردنی گوڵی شلێرو میلاقو خاوو گیابەندو گوڵەڕوون هەمووی تووش بوونی غەمو دەردە بۆن کردنی گوڵی نەستەرەنو نەسرینو بەی بوون مارە کردنی کچێکی جوانو هۆشیارە: گوڵی هێرزو حاجیلە تەن درووستییە. گوڵی بنەوشەو نێرگزو خەزنمە داخوازی کچێکە کە بۆی نابێ. گوڵی نەورۆزو. ناسکە بێزووبنان لە خەودا بۆن کردنیان شادییە. گوڵی نارنجو هەرمێو سێوو پرتەقاڵ بۆ کەسێک لە هەرێمی سارد بۆیت نەخۆشیو دەردە بەڵام بۆ کەسێک لە هەرێمی گەرم دەژی دەوڵەمەندییە: چاندنی هەر گوڵێک بە هەر جۆری هەبێت سوود گەیاندنە بە خەڵکی هەرێمەکە. هەروەها هەڵ قەندنی زیان گەیاندنە بە خەڵکەکە.

گۆڕ: قەبر:

کەسێک لای وابوو لە خەوداگۆڕ بۆ خۆی هەڵ دەقەنی ئەوە ژن دێنێ ئەگەر لای وابوو قەبر پڕ دەکاتەوە ئەوە تەمەنی درێژ دەبێ کەسێ لای وابوو بە زیندوویی خرایە ناو قەبر ئەوە حەپس دەکرێ ئەگەر لای وابوو کەسێک لە گۆڕ هاتە دەرێو ویستی ئەو بخاتە گۆڕ ئەوە کەسێک بوختانی پێ دەکات ئەگەر لای وابوو هەڵ قەندنی قەبر گەیشتنە جەنازەو ئەوە تووشی شادی دەبێ:

گـەنـم:

خواردنی گەنم بە ورشکی تووشی بـوونی دەردە. دەست وەردان لە گەنم گران بوونی نرخێتی. بۆگەن بوونی گەنم گوناح کردنی خەڵکە ـ گران بوونی گەنم هەرزان بوونی جۆیە. بەشی ئەوەی گەنم بە سـەر هـەژاراندا سوێند خواردنی بەدرۆیە گەنم بارین لە ئاسمان هـەرزانی‌و خۆشی‌یە: ئەگەر مردوو گەنم بکڕێ ئەوە نرخی گران دەبێ.

گیرفان: باخەڵ: بەرک: بەری:

گیرفانی توندو ڕێک لە خەودا کـەسێک هـەیبێ داپۆشینی عـەیبی خەڵکە. بەڵام دڕانی گیرفان لە خەودا بڵاو کردنەوەی نهێنی خۆی و خەڵکە کە تێدا تووشی ماندوو بوون دەبێ:

گۆچان: گۆپاڵ: گالوک: چەلاک:

کەسێک لای وا بوو لە خـەودا گـۆچانی بـە دەسـتەوەیە ئـەوە دەبێتە پێشەوای نوێژ یان خزمێکی شکانی گۆچان لە دەستی هەر کەس لە خەودا تووش بوونی دەردەسەری‌یە.

گـوێ:

گەورە بوونی لە خەودا دینداری‌یە بچووک بوونی لادانە لە ئاین زۆر بوونی گوێ فێر بوونی شتی بەسوودە بڕینو هێشانی گوێ کردنی کاری بێ ئابڕووانەیە. کەسێ لای وابوو گوێی بووتە گوێی ئاژەڵ ئەوە دەستەڵاتی کەم دەبێ کەسێ لای وابوو قـامکی لە گـوێی خـۆی وەردەدا ئـەوە بـە ئیمانەوە دەمرێ. خواردنی چلکی گوێ تیربازی کردنە. ئاخنینی گوێ بـە

کافری مردنە. ڕاکێشـانی گوێ ئامۆژگاری کردنە.

گـوێـز:

خواردنی تەڕ درووستـی یە: چاندنی داری گوێز خەریکبوونی ئیشێکی زەحمەتە بڕینی داری گوێز وازهێنانە لە کارو کاسبی:

گـەرما:

تووش بوونی گەرما لە خەودا لە زستانا. ژیانی خۆش و شادیە... بەڵام لە هاوینا هەژاری یە. خواردنی شتی گەرم بەدەست کەوتنی ڕزقی زۆرە شـووشتنی مـردوو بـە ئاوی گـەرم نیشانەی چوونی مردووەکەیە بۆ جەهەننەم:

گەوادی: پێناو:

کەسێک لای وابوو پێناوی دەکرد لە نێوان ژن و پیاوی نامەحرەم ئەوە لادانە لە فەرمانی ئایینی ئیسلام.

گەوهەر:

بەدەست کەوتنی گەوهەر لە خەودا فێر بوونی مانای قورئانی پیرۆزە:

گالیسکە: عارەبانە:

سوار بوونی لە خەودا داخوازی ژنێکە بۆی نـابێت. کـڕینی گـالیسکە خزمەت کردنی هەژارانە بە ماڵ شکانی گالیسکە لە دەست چوونی ماڵە بە هزی ئیشی سووک.

**گێلی: دەلویی:**

ئەگەر لای وابوو لە خەودا گێل بووە ئەوە ڕوو دەکاتە کەم دینیو یان شیربایی دەخوات.

**گریان:**

گریان بە دەنگ تووش بوونی غەمو دەردە بەڵام بە بێ دەنگی دینداریو شادی یە:

**گزیر: خویزە:**

کەسێک لای وابوو لە خەودا بوویتە گزیری کار بەدەستان ئەوە لادەدا لە دینداریو ڕوو دەکاتە تاوان کردن:

**گۆڕستان قەبرستان مەقبەرە:**

دیتنی گۆڕستان کە هی موسوڵمانان بێ تۆبە کردنە لە گوناحان. بەڵام دیتنی گۆڕستانی کافران: لادانە لە فەرمانی خوا. خوێندنی قورآن لە سەر گۆڕستان یارمەتی هەژارانە بە پارە بۆ خوا..

**گێرە کردن:**

گێرە کردنی دەغلوودان لادانی حەسوودی یە لە دەروون..

**گەدە: مەعیدە:**

هێشانی گەدە لە خەودا ئازاوەیە لە لایەن ماڵو منداڵی خۆی بێ هێزی مەعیدە کەم بوونی دەستەڵاتی خاوەنێتی:

گەسک:

ماڵینی زەوی بە گەسک ئامووژگاری کردنی ژنەکەیەتی بۆ چاکە کردن سورتانی گەسک لە دەستی هەر کەسێک تووش بوونی دەردی ساماناکە بەڵام چاکبوونەوەی چاوەنوار دەکرێ:

گێزەر:

خواردنو چاندنی لە خەودا ئاسان بوونی کاری ژیانە:

گوێز:

خواردنی گوێز بەدەست کەوتنی ماڵی زۆرە. چوونە سەرداری گوێز پشت بەستنە بە کەسێکی بەهێز بۆ ئیشو کاری خۆی. داوەشاندنی گوێز خێر کردنە بە هەژاران. خواردنی گوێزی هێندی فێر بوونی زانیاری ئەستێرە ناسی‌یە یاری کردن بە گوێز خواردنی ماڵی حەرامە:

گامێش:

بنوارە چێڵ.

گێلاس:

خواردنی لە خەودا تەن درووستی‌یەو ژیانی شادی‌یە.

گــاز:

بەدەست کەوتنی لاچوونی ئاژاوەیە لە ماڵی خاوەنەکەی.

گڵ: خۆڵ: خاک:

هەڵ قەندنی گڵ لە خەودا ژن هێنانە بۆ بێ ژن. بۆ بازرگان سوودی زۆرە خۆڵ بە سەرا کردن تووش بوونی غەمە. خواردنی خۆڵ خواردنی ماڵی حەرامە خۆڵاوی بوونی بەدەنو جل دەوڵەمەند بوونی خاوەنەکەیەتی بارینی خۆڵ. غەمو دەردە بۆ خەڵکی هەرێمەکە:

گوبنەد:

راوەستان لە بن گوبنەددا پشت بەستنە بە کەسێکی هێزدارو دادوەر دیتنی گوبنەدی جوان بڵاوبوونەوەی دادوەرییە لە وڵات ڕووخانی گوبنەد.ڕووخانی پاشای وڵاتە.

گرمە:

گرمەی هەور لە خەودا لە هەرێمێک گوناح کردنی خەڵکەکەیە.

گەستن:

کەسێک لای رابوو یەکێک گەستیو هێشاندی ئەوە قسەی ناخۆشی بەرانبەر دەکرێ لە لایەن ناحەزەوە:

کورچیلە:

هێشانی لە خەودا ئازاردانی بابو داکە. جوانی و پتەوی خزمەت کردنی بابو داکە. خواردنی کورچیلە گەیشتنە بە ئاوات...

گۆرانی: بەستە: ستران: بەند:

وتنی لە خەودا بە دەنگی بەرز تووشبوونی غەمو خەفەتە بەڵام بە

نزمی مزدەی خۆشە.

دیتنی گۆرانی بێژ لە خەودا برادەرایەتی کەسێکی تەنەڵو چاو لە دەستی خەڵکە:

گرد: تەپۆلکە:

ڕاوەستان و ووتاردان لە سەر گرد دەست کەوتنی پایەی بەرزە ڕووخانی گرد لە خەودا مردنی پاشای وولاتە...

گوارە: گۆشوار:

ئەگەر کچێ لای وابوو گوارەی کردە گۆیی ئەوە مێردی باشی دەست دەکەوێ بەلام بۆ پیاو گوارە کردنە گۆی غەمو خەفەتە گوارەی زێر بۆ ژن کە بێکانە گوێ دەست کەوتنی کوڕێکی قورئان خوێنە بەلام هی زیو کوڕێکە نیوەی قورئان دەخوێنێ.

گەردەلول گێژەلوکە:

هاتنی گەردەلول لە هەرێمێک کە خانوو بەرە بڕووخێنێ ئەوە پەیدا بوونی غەزەبی خوایەو مردنی زۆری خەڵکەکەیە.

گەردە لەغ: گەردانە: دوربەند:

گەردانە لە مل کردن بۆ پیاو دەست کەوتنی پایەی بەرزە. بۆ ژن ئەگەر زێڕ بێ گەیشتنە بە ئاوات پسانی گەردانە لە ملی شوو کردنە لە ملی ژنی بە مێرد تەلاقدانە پسانی دوربەند لە ملی پیاو لاچوونی غەمو خەفەتە:

گەنە:

کەسێ لای وابوو لە خەودا گەنە پێوەیدار هێشاندی ئەوە لە لایاد

کەسێکی ناکەس بوختانی پێ دەکرێت. کوشتنی گەنە ڕزگار بوونە لە غەم.

گزرەوی:

گزرەوی جوان لە پێ کـردنی زەکـات دانـی مـاڵە بـە تـەواوی دڕانـی گزرەوی سەرف کردنی ماڵە بێ سوود. چنین گزرەوی کۆ کردنەوەی ماڵە.

گـــون:

ئەستووری گون لە خەودا هێزوو دەستەڵاتە بچووکی بێ دەستەڵاتی بە ئەگەر ژنی لای وابوو گونی هەیە ئەوە بەس کوڕی دەبی: ئەگەر لای وابوو دوو گونی هەیە ئەو ژنە دوو کوڕی بە جارێ دەبێ هێنانی گون نەخۆشی ژنی خاوەنیەتی:

گـوڵاو:

بەخۆدا کردنی گوڵاو لە خەودا بۆ پیاو مردنی نزیکە بۆ ژن بەختیاریبە خواردنی لە خەودابار کردنە لە گوندی خۆی بۆ گوندێکی دوور...

گەزۆ: گەزگولە: شۆک:

کەسێک لای وابوو لە خەودا یەکێک گەزگولەی بۆ هێنا بە دیاری ئەوە مژدەیێکی خۆشی پێدەگات دەربارەی خزم و کەسێ خۆی.

گلەیی:

گلەیی کردن لە کەسێک یان کەسێک لە ئەو ژن بە ژن کردنە کە ئەنجامی

**گویزان: چەقوی موتاشین**

دەست کەوتنی گوێزان لە خەودا پەیدا بوونی کورێکی خوێندەوارە موو تاشین بە گوێزان لاچوونی غەمە. گۆشت بڕین بە گوێزان غەیبەت کردنی خەڵکە.

**گومرگ: باج:**

ئیشی کردن لە گومرگ بە هەموو جۆری بێ فەرمانی خوایە کە دەیکات پێویستە تۆبە بکات.

**گندۆرە کاڵەک:**

خواردنی گندۆرەی زەرد تووش بوونی غەم و دەردە. هی سەوزو سووررو بۆرو سپی بە دەست کەوتنی ماڵی دونیایە بە حەڵاڵی دیتنی گندۆرە فرۆش لە هەرزنێک یان خۆی گندۆرە بفرۆشێ سوود گەیاندنە بە خەڵک بە جێبەجێ کردنی کاریان.

**گژنیژ:**

چنینی گیای گژنیژە لە خەودا کردنی کاری بێ سوودە هەڵ قەندنی لە خەودا لاچوونی غەمە.

**گیـــا:**

دیتنی گیا بە هەموو جۆرێ لە خەودا دڵ خۆشی یەو تەمەنی درێژە:

# « پیتی لام »

**لوط پی‌غه‌مبه‌ر د.خ:**

به خزمه‌ت گه‌یشتنی له خه‌ودا تووش بوونی غه‌م‌و خه‌فه‌ته دیتنی ژنی لوط له هه‌رنمێک په‌یدا بوونی نێربازی‌یه له‌و هه‌رنمه:

**(لوح المحفوظ):**

دیتنی له خه‌ودا. چوونی به‌هه‌شته له دوای مردن. خوێندنه‌وه‌ی شت له (لوح المحفوظ) دڵپاکی‌یه‌و فه‌رمان کردنه به چاکه:

**لـۆلـۆ:**

هێنینه‌وه‌ی له خه‌ودا له به‌ر کردنی قورئانی پیرۆزه. کـون کـردنی فێر بوونی مانای قورئانه. که‌سێک لای وابوو له ناو ده‌ریا لۆلۆئی ده‌رهێنا ئه‌وه له لای پاشای وولآت خه‌لآت ده‌کرێ:

**لاله: سوره‌یا:**

بنواره چرا:

**لـم:**

بنواره زیخ:

لـولـه:

دەست کەوتنی دەستەڵاتە شکانی لولە بێ دەستەڵاتی خاوەنیتی: لولەی دار بەدەست کەوتنی دینداری‌یە:

لێو: لچ:

جوانی لێو لە خەودا قسە کردنی باشە بۆ کۆمەڵ ناشرینی لێو قسەی بێ سوودە دوولەت بوونی لێوی سەرێ گرتنی دوو برادەری باشە لەت بوونی لێوی خوارێ مارە کردنی دوو ژنە: نەمانی لێو لە دەست چوونی برادەروو ژن تەلاقدانە هێشانی لێوو ئەستوور بوونی. دووزمانی کردنە لە ناو کۆمەڵ:

لە پی دەست بەری دەست:

جوانی بەری دەست لە خەودا خێر کردنە بە هەژاران. هێشانی بەری دەست سەرف کردنی ماڵە بە بی‌فایدە فراوانی بەری دەست زەکات دانە تەسکی بەری دەست گرتنی ماڵی دونیایە:

لێرەوار: دارستان:

دیتنی لێرەوار بە جوانی گرتنی برادەرانی بەسوودە: سوروتانی لێرەوار بە ئاگر گوناحکردنی خەڵکی هەرێمە:

لانک: بێشکە

کڕینی لانک بۆ منداڵ تووش بوونی شادی‌یە درێژ بوونی ناو لانک لاچوونی غەمە شکانی لانک مردنی منداڵی خاوەنەکەیەتی:

لغـــاو:

لغاو کردنە زار لە خەودا ڕۆژی گرتنە. سوار بـوونی وولاغـی بـە لغـاو گەیشتنە بە ئاوات. شکانی لغاوی وولاغ مردنی مەیتەری وولاغەکەیە.

لیمــۆ:

خواردنی بۆ نەخۆش چاک بـوونەوەیە بـەلام بـوو لەش سـاغ تـووش بوونی دەردوو نەخۆشی‌یە:

لادان لە خەراپە:

کەسێ لای وابوو لە خەودا لە خەراپە کـردن لایـدا ئـەوە ڕوو دەکـاتە کرداری دینداران بە دڵـــۆزی:

لـاد: نمەد:

بەدەســت کەوتنی لە خـەودا جـێ‌بەجێ بـوونی مـەبەستە کـەیەتی کـە هەیەتی دڕانی لـاد لە دەست دانی کاتی پێ‌ویـستە بۆ ئیشوو کار. کردنی لـاد سەرکەوتنە لە ژیاندا. لـاد کەر دیتنی لە خەودا دەوڵەمەندی‌یە.

لیفـــە:

بەدەست کەوتنی لیفەی جوان مـارە کـردنی ژنـی بـاشە. دڕانـی لیـفە نەلاقدانی ژنی خاوەن لیفەیە:

لیفکـــە:

کڕینی لیـفکە لە خـەودا وەرگـرتنی تـەریقەتی نـەقشـبەندی‌یە دڕان و

پسانی جێبەجێ نەکردنی یاسای تەریقەتە: خۆ شوورشتن بە لیفکە تۆبە کردنە لە گوناحان.

**لاولاو:**

بۆن کردنو چاندنی لە خەودا حیلەبازی کردنە لە گەڵ خەڵک...

**لاووک:**

بنوارە گۆرانی.

**لاسار:**

لاساری کردن لە خەودا تووش بوونی خەمو خەفەتە جا لاساری‌یە.

**لینوفەر: لەیلووپەڕ:**

بەدەست کەوتنو چاندنی جێبەجێ بوونی ئاواتە بە ئاسانی خواردنی تووش بوونی برادەری نالەبارە.

**لەقە: لوشکە:**

لوشکە وەشاندن لە خەودا دەعیەلێدانە بەهۆی ماڵی دونیاوە ئەگەر کەسێک لەقەی لە کەسێکدا ئەوە بوختان بەو کەسە دەکات.

**لەنجە:**

رۆیشتنی بە لەنجە بۆ پیاو تووش بوونی پێدەستەلاتی‌یە بەلام بۆ ژن بەختیاری‌یە لای مێردی یان کەسو کاری.

لۆر: لۆرکە: لە شیر درووست دەکری

خواردنی لە خەودا مزگێنی خۆشە درووست کردنی لە خەودا کاسبی کردنی حەلاڵە:

لورەی گورگ:

بیستنی لە خەودا ترسانە لە زۆردار بەلام زۆردارەکەش ناتوانی زیانی لی بدات:

لورەی سەگ:

بیستنی لە خەودا هاتنی بەلایە بۆ سەر خاوەنی سەگەکە. ئەگەر خاوەنی نەبوو ئەوە بەلایە کە بۆ سەر خەڵکی هەرێمەکە دەبێ.

لیکــاو:

هاتنە خواری لیکاو لە زار خۆشەویستی یە لای خەڵک بەهۆی قسەی باش.

لەڕی لاوازی:

لاوازی لە خەودا کەم دینی یەو لادانە لە فەرمانی قورئان..

لافاو: لێمشت: لێشاو: سێلاو:

هاتنی لافاو بەزۆری بۆ هەرێمێک هاتنی عەسکەری پاشایە. ئەگەر لافاوەکە زیاندار بوو ئەوە عەسکەرەکە زۆرداری دەکا لە خەڵک لافاوی خوین غەزەبی خوایە بەهۆی گوناحی زۆرەوە هاتنی لافاو بۆ ناو شارێک

پەیدا بوونی دەردی ساماکە لەو شارە:

**لاسایی:**

کەسێک لە خەودا لاسایی کەسێک بکاتەوە ئەوە بە دوای ڕەووشتی ئەو دەکەوێ:

**لایەلایە:**

کردنی بۆ منال لە لایەن پیاوەوە دەردو غەمە لە لاین ژنەوە خۆشی‌یە

**لاواندنەوە: پێ‌هەڵ ووتن:**

کەسێک لای وابوو کەسێک دەلاوێنێتەوە ئەگەر دونیایی بوو ئەوە ڕیایی کردنە لە بەر دەوڵەمەند بەڵام ئەگەر ئەوەی دەی لاوێنێتەوە ئاینی بوو ئەوە بڕوای پێەوە بۆ ئەوەی لاواندنەوە دەکات:

**لـــوس:**

دەست لێدانی هەر شتێ لوس کردنی کاری بێ ئابڕووانەیە:

**لەرزین:**

بەدەن لەرزین لە خەودا بە گشتی ترسانە لە خوا. سەر لەرزین بەدەست کەوتنی پایەی بەرزە لە لای پاشاوە. لەرزینی ڕان تووش بوونی غەم‌و خەفەتە بەهۆی کرداری ناڕەوای خزم‌و کەسی... دەست لەرزین هەژاری‌و دەست کورتی‌یە:

لول دانی شت:

لول دانی هەر شتێک لە خەودا ژووان گرتنە لەگەڵ ژن بۆ کردنی خراپە:

لاو: گەنج: هەرزەکار: کوڕوکاڵ: تۆلاز: عازەب:

دیتنی گەنجێکی ڕەنگ سپی لە خەودا دووژمنێکی بەدزییە. ئەگەر ڕەشتاڵ بوو.

ئەوە دووژمنێکی دەوڵەمەندە. ئەگەر چاوشین بوو دووژمنێکی پیرە مارە کردنی کچی گەنج زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا کوشتنی گەنج ڕزگار بوونە لە دووژمن گەنج بوونەوەی پیرێک لە خەودا ژیانی شادییە. دیتنی کچی گەنج مزدەی خۆشە کەسێک لای وابوو پیرەژنێکی دیت بۆوە بە گەنج ئەوە ئەو کەسەی دیویە دەوڵەمەند دەبێ. دیتنی مردووی پیر بە جەحێڵی چوونی بەهەشتە بۆ مردووەکە:

لـــو:

کەسێ لای وابوو لوی لە بەدەنی هاتووە ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبێ

لێ بوردن:

لێ بووردن لەو کەسەی تاوانت بەرانبەر دەکات لە خەودا ڕازی بوونی خوایە لەوەی بووریوە:

لێدان:

لێدانی بێ ئازار لە هەر کەسێک سوود گەیاندنە بەو لێدراوە بەڵام کە ئازاری هەبێ بوختان کردنە بە لێدراوە کە:

لستنەوە:

لستنەوەی قامک بەدەست کەوتنی ماڵێکی کەمە:

لۆمە کردن: سەرزەنش تانوت لێدان:

کەسێک لای وابوو لۆمەی خۆی دەکرد ئەوە تووشی کارێ دەبێ کە سەری لێ دەشێوێ هەروەها لۆمەی هەموو کەس وەهایە.

لەوەڕگا:

کەسێک لای وابوو لەوەڕگەی هەیە ئەوە دەستەلاتی زۆر دەبێ بردنی ئاژەڵ بۆ لەوەڕگاه دەست کەوتنی پایەی بەرزە ئەگەر کەسێک لای وابوو دوو ئاژەڵ لە ناو لەوەڕگەی ئەون ئەوە دوو کەس حەز لە ژنی دەکەن سووتانو ووشک بوونی لەوەڕگا هەژاری خاوەنەکەیەتی.

# « پیتی میم »

**محمد پێغەمبەر درورودی خوای لە سەر بێ:**

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا بە هەر جۆرێ هەبێ بڕوای پتەوو کردەوەی باشە بەڵام هەندێ لە زانایانی خەون ناسین دەڵین دیتنی بەڕووی گرژ گوناح کردنی زۆرە لە لایەن کابراوە. کەسێ لای وابوو پێی لەجێ پێی ئەو دەنا لە ڕۆیشتن ئەوە ڕەووشتی ئەو جێبەجێ دەکات. زیارەتی گوڕی پێغەمبەر ژیانی شادیوکامەرانییە حەج کردنەکەسێک لای وابوو خوێنی پێغەمبەری بەرزی خواردەوە ئەو بە شەهیدی دەمرێ بەڵام بە ئاشکرایی خواردنەوەی خوێنی ئەوە کەم دینییە. هاتنی بۆ وڵاتێک خۆشی و شادی خەڵکەکەیە. مردنی لە هەرێمێک کەم بوونەوەی ئاین پەرستنە لەوێ: دیتنی جەنازەی لە هەر جێگایی تووش بوونی خەڵکە بە غەم و دەرد: ئەگەر لای وابوو پێغەمبەر شتێکی دابە ئەگەر ئەو کەسە بۆ پاشایی بشێت دەبێتە پاشا ئەگەر نا لە ژیاندا ئەوپەڕی بەختەوەر دەبێ ئەگەر لای وابوو وێنەی وەک وێنەی پێغەمبەر لێهات ئەوە دەبێتە پێشەوایێکی مەزنی ئاینی. ئەگەر لای وابوو پێغەمبەر بانگی نوێژی دا لە هەرێمێک ئەوە خۆشی زۆر بۆ خەڵک دەبێ ئەگەر لای وابوو بوو بە کوڕی پێغەمبەر موسوڵمانان یەک دەگرن ئەگەر لای وابوو بوو بە کوڕی پێغەمبەر ئەوە ئیمانی بەهێز دەبێ ئەگەر لای وابوو پێغەمبەر درورودی خوای لێ بێ گل

لە چاوی خۆی دەکا ئەو کەسەی دیویە بە ئیمانەوە دەمرێ. ئەگەر لای وابوو ریشی پیرۆزی درێژەو ڕەشە ئەو کەسەی دیویە دەکەوێتە شادی و خۆشی ئەگەر لە ناو عەسکەرێکی دی بە چەکەوە ئەو عەسکەرە بە سەر دوژمندا زاڵ دەبێ. ئەگەر کەسێک پێغەمبەری دی بە پێی پەتی ئەوە ئەو کەسە نوێژی بە جەماعەتی تەرک کردووە:

بە کورتی بە خزمەت گەیشتنی حەزرەتی (محمد) دروودی خوای لێ بێ بە هەموو جۆرێ بەختیاری دین‌و دونیایە چوونکە خۆی فەرموویەتی:

من رأني في المنام رأى الحق فان الشيطان لا يتمثل بي:

واتە هەر کەسێک لە خەودا من ببینی ئەوە بە ڕاستی منی دیوەو منم چوونکە شەیتان ناتوانی وێنە و شێوەی من وەرگرێ وەک خۆی بنوێنێ:

## موسا پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ:

بە خزمەت گەیشتنو دەست ماچکردنی لە خەودا مردنە بە موسوڵمانی. دیتنی لە وڵاتێک لە ناو چوونی زۆردارانە لەو وڵاتە. دیتنی دەست بەدارعە ساوە زاڵ بوونی موسوڵمانانە بە سەر دوژمندا. ئەگەر نەخۆش‌و قەردارو حەپس کراو بە خزمەتی بگات ئەوانە ڕزگار دەبن:

## میکائیل:

بە خزمەت گەیشتنی بۆ کەسێکی گوناحبار ئاگادار کردنەوەیەتی بۆ تۆبە کردن بەڵام دیتنی بۆ دیندار مژدەیە بە چوونی بەهەشت وە بۆ ژنی بێ‌منداڵ بە منداڵ بوون ئەگەر لە هەرێمێک دیترا کە بارانی کەم بێ ئەوە بارانی زۆری لێ دەباری:

ملائکەت فریشتە: پێ‌مێردی خوا:

کەسێک لای وابوو بە خزمەتیان گەیشت و قسەیان لە گەڵا دەکرد ئەوە ئاین پەرستنی بەهێز دەبێ. فرین لە گەڵیاندا مژدەیە بە بەهەشت هاتنی ملائکەت بۆ وڵاتی ئەگەر خەڵکی وڵاتەکە لە شەڕدا بن ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووژمندا ئەگەر لە شەڕدا نەبن و بەڵام خەڵکی هەرئەمەکە لیان دەترسا ئەو خەڵکە تووشی دەرد دەبن ئەگەر لای وابوو لە گەڵ مەلائکەت جیماعی کردوو لای خۆش بوو ئەوە پایەی بڕلند دەبێ ئەگەر نادەمرێ. هاتنی مەلائکەت بۆ بازار مانای وایە خەڵکی بازار لە پێوان و کێشان حیلە دەکەن. ئەگەر لای وابوو چەکی پێ‌یە مەلائکەت لیان ستاند ئەوە لە ماڵی دونیا دەستی کورت دەبێ.

مەرریخ:

دیتنی ئەستێرەی مەرریخ زۆربوونی کوشتاروو خوێن ڕشتنە لە دونیادا بەهێزی شەڕ کردنی دەوڵەتان.

موشتەری:

دیتنی ئەستێرەی موشتەری لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزە

موزدەلیفە:

چوونی لە خەودا قەرددانەوەیەو زیاد کردنی ئاین پەرستنە..

مەقامی ئیبراهیم:

حەونە ناوی لە خەودا ڕزگاری‌یە لە هەموو پەژارەو زیانی نالەبار.

مینـــا:

چورونی له خەودا گەیشتنه به ئاوات. هەروەها کچ بە شـوودانـه بـه بـێ تەماع.

مزگەوت:

درووست کردن و هاتوو چۆ کردنی و خزمەت کردنی ئایین پەرستـنه بە دلّـــسۆزی: ڕووخانی مزگەوت مردنی عالمی ئایینی‌یە. کـەسـێ لای وابـوو چوو بۆ مزگەوتێکی نوێ ئەوە هەر ئەو ساڵە حەج دەکات ئەگەر لای وابوو مزگەوت بوو بوو بە حەمام ئەوە مەلایێکی ناودار تاوانێکی گەورە بەرانبەر ئایین دەکات ئەگەر لای وابوو ماڵی یان دووکانی بووبتە مزگەوت ئـەوە زەکاتی شـەرعی دەدات ئەگەر لای وابوو فەرشی مزگەوت دڕاوون ئەوە خەڵکی گەڕەک وازیـان لە دیـنداری هێـناوە. کـەسێک لای وابـوو لە نـاو مزگەوت مردووە ئەوە تۆبەی دەکات لە گوناحان.

میحڕابە:

نوێژ کردن لە مێحڕاب مژدەیە بە چـوونی بـەهەشـت. کـەسـێک لای وابوو دوو دڵۆپەی مێز لە ناو مێحڕاب کرد ئەوە دوو کوڕی دەبێ. ڕووخانی مێحڕاب لادانی خەڵکە لە دینداری.

جـوانـی مـێحڕاب. زیـاد بـوونی دیـنداری‌یـە بـۆ خـەڵکی گـەڕەکـی مزگەوتەکە.

مینبەر:

کـەسـێک لای وابـوو وتـاری دەدا لە ســەر مـینبـەر ئـەوە دەبـێتە

کاربەدەستی هەرێم ڕووخانی مینبەر بێ هێز بوونی پاشای وڵاتە: کەسێ لای وابوو لە مینبەری سێ پایە سەرکەوت ئەوە ڕێبازی دینداران دەگرێ.

منـــارە:

کەسێک لای وابوو لە سەر منارە زکری خوای دەکرد ئەوە پایەی بەرزی دەست دەکەوێ. ئەگەر لای وابوو لە منارە کەوتە خوارەوەو کەوتە ناو چاڵێکەوە ئەوە ژنێکی لاسار مارە دەکات.

مەیدان: کۆرەپان:

کەسێک لای وابوو لە مەیدان وەستاوە ئەوە بە سەر دووژمندا سەردەکەوێ یان دەبێتە سەرزکی کۆمەڵی موسوڵمان:

مەککـــە:

چوونی شاری مەککە زاڵ بوونە بە سەر ناحەزدا. بۆ نەخۆش چاک بوونەوەیە بەڵام دەردەکەی درێژ دەبێ. ئەگەر لای وابوو ماڵی لە نزیک مەککەیە ئەوە لە بەر پیری پەکی دەکەوێ. ئەگەر لای وابوو خانووی مەککەی دەرووخان ئەوە تەرکی نوێژ دەکات ئەگەر لای وابوو چوو بۆ مەککەو لە گەڵ مردووان لەوێ تەی دەکرد ئەوە بە شەهیدی دەمرێ. چوونی مەککە بۆ بازرگانی واز هێنانە لە دینداری:

مەدینە:

چوونی ناو مەدینەی پێغەمبەر بە هەموو جۆری بەختیارییە لە دین و دونیا دینداری کردنی ڕاستەقینەیە:

**مەقلی: تاوە: مەدنە:**

کەسێک لای وابوو مەقلی هەبە ئەوە ژنەکەی خۆیەتی کە منداڵی بۆ نامێنێ:

**مەقەست: برێنگ:**

کەسێک لای وابوو مەقەستی پێیەوە سمێڵ و ریشی خەڵکی پێ کورت دەکرد ئەوە غەیبەتی خەڵک دەکات. برینەوەی مەرەزو خوری بە مەقەست دەست کەوتنی ماڵی دونیایە. شکانی مەقەست جێ‌بەجێ نەبوونی کاروباری خاوەنەکەیەتی:

**مـردوو:**

دیتنی بە شادی و بەرگی جوانەوە لە بەهەشتە بەڵام بە غەمباری و بەرگی نابود ئەوە لە جەهەنەمە زیندوو بوونەوەی کچی مردوونێک. شادی‌یە بۆ مردووەکە. کەسێک لای وابوو دایکی زیندوو بۆوە ئەوە تووشی غەم دەبێ. بەڵام هی ژنی دەوڵەمەندی‌یە: هی کوری زیندوو بوونەوە نەخۆشێک کە بە نەخۆشی‌ییەکی توند مردبێ مانای پلەی شەهیدی وەرگرتووە ئەگەر لای وابوو کافرێکی زیندوو کردەوە ئەوە گوناهبارێک بە قسەی ئەو تۆبەی دەکات لە گوناحان. زیندوو بوونەوەی باب و داکت کەم دینی‌یە دەبکا. هی خاڵ و مام بە دەست کەوتنی پایەی بەرزە. هاتنی مردوو بۆ ماڵی هەرمەس بە شادی قەبوڵ بوونی دوعای خاوەن ماڵەکەیە لای خوا. دیتنی مردوو کە جار بگری و جارجار پێبکەنێ مانای وایە بە کافری مردووە. گەمە کردن لە گەڵ مردوو سەفەر کردنە. رەش بوونی رووی مردوو مردنی بێ‌ئیمانی‌یە. دیتنی مردوو بە بەرگی سەوزەوە یان تاجی لە سەر بێ یان بازنی لە دەستا

بێ یان ئەنگوستیلەی لە قامک دابێ ئەوە بەهەشتی‌یە: هەروەها دیتنی مردوو بە نوروستوویی چرونی بەهەشتە کەسێک لای وابوو مردوونیک دووبارە مردەوە ئەوە ئەو کەسە ژنێک بۆ خزمی خۆی دینێ. ئەگەر مردوو شتێک بخوات یان بکڕێت ئەوە نرخی شتە کە گران دەبێت کەسێ لای وابوو ڕێگە پێشانی مردووان دەدا ئەوە ئامۆژگاری موسوڵمانان بە پاشی دەکات ئەگەر لای وابوو شتێکی دایە مردوو وە مردووەکەش دایەوە ئەوە تووشی غەم دەبێ.

کەسێک لای وابوو مردوونیک شتیکی دایە ئەوە سوودیکی دەست دەکەوێ کەسێک لای وابوو مردوو کۆڵی بە پشتەوەیە ئەوە گوناحی زۆر کردووە. کەسێ لای وابوو لەگەڵ ژنی خۆی کە مردووە جیماعی کرد ئەوە تووشی غەم دەبێ دروونە کردنی مردوو بە داس بەهەشتی‌یە. ماچکردنی مردوو دەست کەوتنی خێرە. کەسێک لای وابوو مردوو ژن دەهێنێ ئەوە یەکێک لە خزمی مردوو ژن دەهێنێ. کەسێ لای وابوو نوێژی جەماعەت بۆ مردوان دەکات ئەوە ئەو مردووانە لە نوێژ کردن تەنبەڵیان کردووە. دیتنی مردووان کە شایی بکەن مانای وایە لە بەهەشتن ئەگەر مردوو شتێ لە کەسێک وەرگرێ ئەوە ئەو شتە گران دەبێت لە نرخدا. ئەگەر مردوو ئامۆژگاری هەر کەس بکات بە هەر جۆرێ پێویستە بە قسەی بکات چوونکە ئەوەی مردوو بیڵێ ئەوە ڕاستە:

مەرەکەب:

خولردنی لە خەودا بەرگری کردنە لە مارە کردنی ژنێک لە پیاوێک کە هەردووکیان حەز لە یەک دەکەن. نووسینی بە مەرەکەب جێبەجێ کردنی کاری هەژارانە بۆ خوا. درووست کردنی: کردنەوەی کتێب خانەیە:

مسقاڵ:

بەدەست کەوتنی لە خەودا فەرمان کردنە بە چاکە.

مەندیل: مێزەر: دەسماڵ: شاشک:

لە سەر نانی مەندیلی سپی دینداری‌یە. هی زەرد نەخۆشی‌یە. هی ڕەش پایەی بەرزە. هی سەوز دەست کەوتنی کچێکی ڕەسەنە. دڕانو کۆنیو چڵکنی مەندیل کەم دینی خاوەنەکەیەتی.

ماسی:

گرتنی ماسی گەورە دەوڵەمەندی‌یە بەڵام بچووک تووش بوونی غەمە کەسێک لای وابوو خەریکی گۆشت خواردنی ماسی‌یەو یەکێک هات لە گەڵی خوارد ئەوە ئەو کەسەی هاتووە حەز لە ژنەکەی دەکات دۆزینەوەی ئەنگوستیلە لە سکی ماسیدا دەست کەوتنی پایەی مەزنە. خواردنی ماسی بۆگەن خواردنی ماڵی حەرامە. برژاندنی ماسی خەتەنە کردنی کوڕێتی هاتنە دەری ماسی لە کێر ئەوە ژنی کابرا کچی دەبێ. بەڵام لە زار کوڕی دەبێ. قسە کردنی ماسی بڵاو بوونەوەی نهێنی پاشای وڵاتە مردنی نەهەنگ لە دەریا مردنی پاشای وڵاتە. هەبوونی ماسی لە ووشکانی جاسووسی کردنی هەرێمەکەیە لە سەر یەکتری.

مار: ئەژدیها: عەزیا:

کوشتنی مار لە خەودا زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا. کەسێ لای وابوو لە ناو ماڵێدا مار هەیە ئەوە منداڵانی خۆی خۆشیان ناوێ. گرتنی ڕق ترت دانەوەیە قسە کردنی مار لە گەڵ کەسێک دەست کەوتنی پایەی بەرزە

دیتنی ماری زەرد دووژمنێکی نەخۆشە هی سەوز دووژمنی بەهێزە هی سوورروو ڕەش پایەی مەزنە دەستی دەکەوێ. کەسێک لای وابوو ماری زۆری لە دەورە ئەوە خزمانی خۆیەتی دووژمنایەتی دەکەن پێوەدانی مار کە نەهێشێ مانای وایە دووژمنی دەیەوێ فێڵی لێ بکات و ناتوانێ. کەسێ لای واوو مار کێری قوت دا ئەوە ژنەکەی زینا دەکات. هاتنە دەری مار لە کێر یان لە زار یان لە قون ئەوە منداڵی خۆیەتیو دووژمنایەتی دەکەن: خواردنی گۆشتی مار دەست کەوتنی ماڵی حەڵاڵە لە لایان پاشای وولات.

مارمێلکە: خاتوونە:

خواردنی گۆشتی لە خەودا کردنی کاری بێ ئابڕووانەیە بە تایبەتی کردنی تێربازییە: کوشتنی مارمێلکە لادانە لە کردەوەی سووک:

مقەڵی:

دەست کەوتنی مقەڵی ئاگروکە ئاگری لە ناودا هەبێتو گەش بێت ئەوە دەست کەوتنی پارەی زێڕە شکانو پسانی مقەڵی لە دەست چوونی ماڵی دونیایە بە هۆی کردنی مەسرەفی بێ فائیدە:

میسک:

بەدەست کەوتنو بۆن کردنی خێر کردنە بە هەژاران بە دزی سووتاندنی لە خەودا هاندانی دەوڵەمەندانە بۆ یارمەتی هەژاران میسک پێدا کردنی کفنی مردوو چوونی مردووەکەیە بۆ بەهەشت: بۆن کردنی میسک بۆ ژن منداڵ بوونە:

**مەشکە:**

دۆ ژاندن لە ناو مەشکە کردنی دینداری‌یە بە دڵسۆزی. بەدەست کەوتنی مەشکە دۆزینەوەی پارەی کۆنە لە بن خاک..
درانی مەشکە لە دەست چوونی ماڵی خاوەنەکەیەتی بە زۆری.

**مۆرانە مۆریکانە:**

ئەگەر مۆرانە لە جلگی کەسێکی دا لە خەودا ئەوە ئەو کەسە تووشی نەخۆشی تاداری دەبێ.

**مێـــز:**

درووست کردنو دەست کەوتنی ژیانی خۆشەو بێ دەردەسەری‌یە شکانی مێز لە دەست چوونی پایەی مەزنە:

**مشک:**

گرتنی مشک لە خەودا مارە کردنی ژنێکی فێڵبازو چەنە هەراشە. پەیدا بوونی مشک لە ماڵی کەسێک ئەوە دەیەوێت دزی لێ بکات گانی مشک لە خەودا منداڵ بوونی ژنەکەیەتی: دیتنی مشکی زۆروو ڕەنگ جیا تەمەنی درێژە ـ دەرچوونی مشک بە کۆمەڵ لە ماڵەکەی کەم بوونی بەرەکەتە لە ماڵ تفەنگ و بەرد هاویشتنی بۆ مشک بوختان کردنە بە ژنێکی بێ‌تاوان. گرتنی مشکی بێ کلک مارە کردنی ژنی ناڕەسەنە خواردنی گۆشتی مشک ـ خواردنی شیربایی‌یە. ئەگەر کەسێک لای وابوو مشکێک هاتووتە سەر جێگای نووستنی ئەوە ژنێکی داوێن پیس دێتە لای.

مەسینە حەوجۆش:

بەدەست کەوتنی لە خەودا و ئیش پێ کردنی ئەوە تۆبە کردنە لە گوناح کردن:

میــز:

مێز کردن بە سەر قورئانی پیرۆزدا پەیدا بوونی کوڕێکی خوێندەوارە: خواردنەوەی میز. خواردنی ماڵی حەرامە. میز کردن بە پێوە کردنی کاری ناشیرینە میز کردن لە ماڵێک خواستنی ژنە لەو ماڵە. میز کردن بەزار غەیبەت کردنی قورئان خوێنە. کەسێک لای وابوو کەسێک میزی پیا کرد ئەوە سوود لەو کەسە دەبینێ.

مل ملانە زۆرەوانە تێک وەرانە:

کەسێک لای وابوو لە خەویا تێک وەرانەی کرد لە گەڵ کەسێک ئەگەر سەرکەوت دەگاتە مەبەستی خۆی. ئەگەر ژێر کەوت ناگات بە ئاوات:

مــازوو:

چنینی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵی حەلاڵە. چنینی مازووی زۆر لە لێرەوار حەج کردنە: چوونە سەرداری مازوو حەج کردنە بۆ داکوور بابی خۆی خواردنی مازوو بۆ نەخۆشی چاکبوونەوەیە بۆ لەش ساغ دەوڵەمەندی یە.

مــردار:

گــۆشتی مــردار لە خــەودا خــواردنــی داهــاتنی گــرانــی نرخی

خواردەمەنی یە. لەبەر کردنی کەوڵی مردار ڕیایی کردنە لەبەر کەسانی ماڵدار. هەڵ گرتنی کەلاکی مردار بە دوا کەوتنی دونیاو لە بیر کردنی فەرمانی خوایە. دیتنی کەلاک لە خەودا دونیایە.

مریشک:

خواردنی گۆشتی بەدەست کەوتنی ماڵە زۆربوونی مریشک لە ماڵدا زاڵ بوونە بە سەر کۆسپی ژیاندا. خواردنی هێلکەی مریشک قوربانی کردنە بەدەست کەوتنی مریشکی جوان مارە کردنی ژنێکی کابانە: هەبوونی جوجەڵەی مریشک پەیدا بوونی منداڵە.

مراوی:

گرتنی لە خەودا ژن هێنانە بۆ بێ ژن مێرد کردنە. بۆ کچ چاکبوونەوەیە بۆ نەخۆش فڕینی مراوی لە دەست کەسێک تەلاقدانی ژنەکەیەتی یان ڕەدرو کەوتنی کچی یان خوشکیتی:

مەیمون: سەکسار:

سواربوونی و گرتنی و گانی لە خەودا زاڵ بوونە بەسەر دووژمندا.. کەسێک لای وابوو مەیمون سواری ئەسپی بوو ئەوە جولەکەیێک بە ژنەکەی فێر بووە. کەسێک لای وابوو مەیمون دەیگا ئەوە لە لایان کافرێک سوردی پێ دەگات. ئەگەر لای وابوو کەسێک مەیمونی دایە ئەوەی وەری گرتووە دڵی تاریکە بەرانبەر ئاینی ئیسلام.

مەجوس:

دیتنی لە خەودا قسە کردن لە گەڵیا نەگەیشتنە بە ئاوات. کوشتنی لە

خەودا بەدەست کەوتنی زیانی خۆشە.

مل:

جوانیو قەڵەوی مل خزمەت کردنی باب و داکیتی بێهێزی مل تووش بوونی غەم و دەردەسەرییە:

مژانە: نیر:

دەست کەوتنی مژانەی جووت لە خەودا دینداری: پتەوو شکانی لە خەودا لادانی خاوەنەکەیەتی لە دینداری.

ماندوو بوون:

ماندوو بوون بە ئیشێکەوە جێبەجێ بوونی ئیشەکەیە.

مەمک:

ئەگەر پیاوێ لای واپوو مەمکی هەیە ئەو ژنێکی باشی دەست دەکەوێ وە ئەگەر ژنی هەبوو ئەوە زیانی خۆش دەبێ. کچێک لای واپوو مەمکی شیری هەیە ئەوە مێرد دەکات بە زوویی. ئەگەر ژنێک لای واپوو مەمکی براون ئەوە کچی دەبێ ئەگەر لای واپوو شیری دابە مێردی خۆی ئەوە لە لایەن مێردەکەی بەختەوەر دەبێ ئەگەر لای واپوو مەمکی شیری نەما ئەوە دەمرێ. ئەگەر ژنێ لای واپوو مەمکی دێشێ ئەوە ئازاری مێردی دەدات:

ماسولکە دەمار:

پتەوی و جوان بوونی ماسولکەو دەمار لە خەودا پەیدا بوونی نەوەی باشە هێنانیان. فەرد نەدانەوەی خەڵکە:

میش:

خواردنی له خه‌ودا ده‌ست که‌وتنی ماڵی دونیایه به‌هۆی ناحه‌زی خۆی که‌سێک لای وابوو مێش که‌وته خواردنی‌و ئه‌ویش به ته‌واوی تقومی کردو خواردنه‌که‌ی خوارد ئه‌وه به دوای سونه‌تی پێغه‌مبه‌ر ده‌که‌وێ هاتنه ده‌ری مێش له زارو لووت ده‌ست که‌وتنی ماڵی دونیایه له لایه‌ن ناحه‌زی خۆیه‌وه:

مۆری ملوانه:

که‌سێک لای وابوو ملوانه‌ی کرده مل ئه‌گه‌ر ئه‌و که‌سه پیاو بوو ئه‌وه تووشی ده‌ردو به‌ڵا ده‌بێ به‌ڵام بۆ ژن به‌ختیاری‌یه له لای مێردی خۆی.

مرواری:

به‌ده‌ست که‌وتنی له خه‌ودا فێر بوونی قورئانی پیرۆزوو هۆنراوه‌ی ئاینی‌یه که زۆر سوودی لێ وه‌رده‌گرێ:

مه‌ستی: سه‌رخۆشی:

که‌سێ لای وابوو به‌هۆی ئاره‌ق‌و شه‌راب‌و بیره له خه‌ودا مه‌ست بوو ئه‌وه به ته‌واوی له فه‌رمانی خوا لایداوه:

مه‌تاره‌ی ئاو:

خواردنه‌وه‌ی ئاو له مه‌تاره شه‌هید بوونه له غه‌زادا کون بوونی مه‌تاره‌ی ئاو ئه‌سیر بوونی خاوه‌نه‌که‌یه‌تی به‌ده‌ست دووژمنی به‌ڵام زوو ڕزگار ده‌بێ خواردنه‌وه‌ی ئاوی مه‌تاره به‌زۆری دوعا کردنه بۆ داک و بابێ خۆی:

مەتاڵی شەڕ:

دەست کەوتنی مەتاڵ کەپڕلابێ پایەی بەرزی خاوێنێتی. شکانی مەتاڵ تووشی بوونی هەژاری یە بۆ خاوەنەکەی لە خۆ بەستنی مەتاڵ: کەسێکی هێزدارە کە یارمەتی دەدات لە ژیاندا.

مامز: ئاسک: ئاهو:

کەسێک لای وابوو لە خەویا مامزی گرت ئەوە کچی جوان مارە دەکات سوار بوونی مامز لە خەوداو هەروەها گانی مامز زینا کردنە لە گەڵ کچێک... بەرد گرتنە مامز تەڵاقدانی ژنێتی فەرخەی مامز پەیدا بوونی کچێکی جوانە ماڵی کردنی مامز مارە کردنی کچێکە کە کچەکە نارازی یە خواردنی گۆشتی مامز دەست کەوتنی ماڵی دونیایە.

مەنجەڵ:

بنوارە دیزە:

مێروو:

زۆر بوونی لە ناو ماڵ پەیدا بوونی منداڵی زۆرە. ڕۆیشتنی لە ناو ماڵ مردنی منداڵی خاوەن ماڵە. دیتنی شارە مێروو لە هەرێمێک زۆر بوونی دیندارانە خواردنی مێروو لە بیر کردنی قورئانە کەسێ لای وابوو مێروولە زاری هاتە دەری ئەوە دەبێتە گۆرانی بێژ یان خزی یان خزمێکی.

ماش:

خواردنو چاندنی مارە کردنی ژنێکی ئابڕوو مەندوو مەردە.

مێـــو:

چاندنی داری مێو کردنی کاروباری بەسوودە بۆ کۆمەڵ بـڕینی داری مێو ئازاردانی باب و داکیتی:

مانگ گیران: ڕۆژگیران:

گیرانی مانگ لە خـەودا مـردنی وەزیـری وولاتـە. ڕۆژ گـیران مـردنی پاشـای وولاتە. گیرانی مانگو بوونەوەی مردنی وەزیـرێکو هـاتنە جـێ ی وەزیرێکی ترە هـەروەها ڕۆژگـیرانو دەرکـەوتنەوەی مـردنی پـاشایـێکو هاتنەوەی یەکی ترە:

مێکوک: بەلەک:

چاندنی مژدەی خۆشە. خواردنی نێربازی‌یە هـەڵ قـەندنی سـەفەر کردنی دوورە:

مـــاست:

درووست کردنو خـواردنـی کـچ بـە شـوودانـی نـابەدڵی کـچەکـەیە. خواردنەوەی ماسـتار لاچوونی غەمو دەردە:

مانگ: هەوی: هەیو:

دیتـی مانگ بە رووناکی لە هەرێمێک دادوەری وەزیری پاشایە شـەڕ کردن لە گەڵ مانگ بەربەرەکانی یەکێکە لە کاربەدەستە لاتەکانی مـێری. گرتنی مانگ لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزە: دەروڵەت بوونی مانگ زۆرداری کردنی وەزیـری پـاشایە: شـەڕ کـردنی دوو مـانگ شـەڕی دوو

پاشایە ئەگەر لای وابوو مانگی یەک شەوە بوو بە مانگی چاردە ئەو یەکێک دەبێتە وەزیر کەسێ لای وابوو مانگ بە تەنیا مانگی یەک شەوەی دیتە ئەوە دەمرێ ئەگەر لای وابوو مانگ ناوابوو ئەو کارەی مەبەستی‌یە جێ‌بەجێ دەبێ ئەگەر لای وابوو مانگ قسەی لەگەڵ کرد پایەی زۆر بەرز دەبێ.

مەڕ:

هەبوونی مەڕوو گۆشت خواردنی لە خەودا بۆ هەر کەسێک ژیانی شادی‌یە و تەمەن درێژی‌یە. کوشتنەوەی مەڕ لە پشتەوە چوونی لای ژنی خۆیەتی لە پشتەوە بیستنی دەنگی مەڕ سکاڵای زۆر لێ کراوانەو خوا وەری دەگرێ: کەسێ لای وابوو بووە تەشوانی مێگەلی مەڕوو دەیباتە لەوەڕ ئەوە دەبێتە سەرۆکی قەومێکی باش مردنی یەک مەڕ. مردنی ژنی خاوەنەکەیەتی بەڵام هی زۆر مەڕ لە دەست چوونی ماڵی دونیایە. خواردنی دوونگی مەڕ تەمەنی درێژە کەسێ لای وابوو گورگ دەرری مەڕەکەی داوە ئەوە کەسێک حەز لە ژنی دەکات بڕینەوەی مەڕ لە کاتی خۆی حەج کردنە بەڵام کاتی خۆی نەبێ وەسیەت کردنە بەوە. کە دوای مردنی خێری بۆ بکەن:

مایین:

بنوارە ئەسپ:

مێگەل:

بنوارە مەڕ:

مشـــار:

بـەدەست کـەوتنو درووست کـردنی جێبەجێ بـوونی کـاروبارێـی شـکانی مشـار بێدەسـتەڵاتی خاوەنەکەیەتی:

مـــزراح:

بەدەست کەوتنیو سـووڕاندنی. تووشـی زیانی خۆشو بێدەردە

مەنجەنیق:

درووست کـردنی لە خـەودا ڕاو کـردنە. مـەنجەنیقی ئـاسن دەست کەوتنی دەسـتەڵاتە.

مانگانە موچە:

کەسێ لای وابوو لای پاشا مانگانەی هەیە ئەوە پاشـەکەوت کردنی ماڵە بۆ منداڵەکانی ئەگەر لای وابوو مانگانەی بڕا ئەوە دەمرێ ئەگەر کەسێک لای وابوو کەسێک بە مانگانە ئیـشی بۆ دەکات ئـەوە خـەریکە ژنـەکـەی هەڵگرێ.

مەلە کردن:

مەلە کـردن لە دەریـادا زۆر بـوونی زانیاری‌یە ئـەگـەر لە مـەلە کـردن گەڕایەوە کەناری ئەوە زانیاری لە بیر دەچێتەوە. بزر بوون لە مەلە کـردنی دەریا مردنی بە زوویی‌یە ئەگەر لای وابوو پاشای وڵات مەلەی دەکرد لە دەریادا ئەوە لەگەڵ پاشـایێکی دەکەوێتە شـەڕکردن. مەلە کردن لە ڕووباردا ڕزگاری‌یە لە غەم مەلە کردن لە نار ئاوی وەستاو خەریک بوونە بە ئیشێ.

یارێکی بەرز بەڵام بزی ناکرێ پشتە مەلە کردن تۆبە کردنە لە گوناحان مردن لە کاتی مەلەوانێدا لە خەودا مردنی کابرایە بە شەهیدی مەلە کردن بەرووتی لە ناو ئاودا مەلەوانە کە دەیتە گزیری زۆرداریک زۆر لە خەڵکی بێ تاوان دەکات ڕۆیشتنی بە سەر ئاودا ـ لە خەودا دینداری کردنی زۆرو پتەوە:

مەرجان:

دەست کەوتنی مارە کردنی ژنێکی جوانە پسانو بزر بوونی لە دەست جەکە: کەسێ لای وابوو مەرجان لە ناو دەریا دەر دەهێنی ئەوە کچی سەرزکی هەرێم حەزی لێدەکات:

مێشک: دەماغ: مۆخی:

هێشانی لە خەودا تووش بوونی کاری ئاستەمە. خواردنی مێشکی ئاژەڵ دەست کەوتنی پایەی بەرزە. ماندوو بوونی مێشک کردنی کاری ناڕەوایەو ئازاردانی باوکی خزیەتی

مورتک:

خواردنی بەری لە خەودا دینداری‌یە دانیشتنی لە بن داری مورتک گرتنی ڕێبازی دیندارانە: بڕینی مورتک لادانە لە فەرمانی خوا درووست کردنی تەسبیح لە بەری مورتک مارە کردنی ژنێکی پاکو دیندارە.

مانگەکان:

دیتنی مانگی موحەڕڕەم شادی. هی سەفەر خەمە. هی رەبیع‌الاول

بەختیاری‌یە هی (ربیع‌الاخر) مژدەی خۆشە. هی (جمادالاول) حەسانەوەیە لە دوای ماندوو بوون. (هی جمادالاخر) خێرو بەرەکەتە هی ڕەجەب وەستانی شەڕە لە نێوان شەڕکەران هی شەعبان بەرەکەتە هی ڕەمەزان دڵ خۆشی کۆمەڵی موسوڵمانانە. هی شەووال سەفەر کردنە هی (ذی‌الحجة) و (ذی‌القعدة) حەج کردنە.

**ماتۆر: تولکەی ئاو:**

خواردنەوەی ئاو لە ماتۆر دەست کەوتنی پلەی بەرزی دونیایەو ژیانی شادی‌یە:

**مافور: قالی:**

بەدەست کەوتنی کردنی لە خەودا تۆبە کردنە لە گوناحان هەروەها چێنی لە خەودا بۆ خوێندەوار دانانی هۆنراوەی بەسوودە بەڵام بۆ نەخوێندەوار لاچوونی هەژاری‌و غەمە.

**مێ بازی: حەز لێ کردن دڵداری:**

بە دوا کەوتنی لە خەودا کردنی کاری سووک‌و بێ ئەنجامە کردنی دڵداری لەگەڵ ژنێک کە بۆی ناشێ بە شەریعەت ئەوە خۆشەویستی‌یە لە نێوانیان:

**مەریەم: دایکی عیسا:**

بە خزمەت گەیشتنی مریەم دایکی عیسا پێغەمبەر بۆ ژن پەیدا بوونی کوڕێکی دیندارو نازدارە بەڵام بۆ پیاو جیا بوونەوەو دوور کەوتنەوەیە لە خزم و کەسی.

مەهدی:

هاتنی (محمد مهدی) لە خەودا بڵاو بوونەوەی دادپەروەریو خێرو خۆشی‌یە

مجلیس: یانە: کۆڕ:

دانیشتن لە یانەی دینداران دینداری‌یە. لە یانەی گوناحباران لادانە لە فەرمانی خووا. دیتنی یانەی بێدەنگ لە خەودا زیارەت کردنی گۆڕستانە.

مــــۆز:

خواردنی لە خەودا مارە کردنی کچێکی عارەبە لە بن دانیشتنی داری مۆز برادەرایەتی دیندارانە. خواردنی مۆز بۆ نەخۆش مردنە بۆ مەلا عیلمی زۆرە کۆ کردنەوەی مۆز گوێڕایەڵی پیاوی ئاینی بە بڕینی داری مۆز کرداری دژی ئاینە:

مەقاش پەنگرکێش:

دررووست کردنو دەست کەوتنی پشتگیری کەسێکی بەهێزە بۆ ئەوەی کـــەوتووتە دەست خــوار بــوونو شکــانی مــەقاش تــووش بــوونی خاوەنەکەیەتی بە دەردی لەرزۆکی:

مـــاچ:

ماچکردنی ژنی خۆی لە خەودا دەوڵەمەند بوونە. ماچکردنی مردوو خێر کردنە بۆ مردووەکە. ماچکردنی دەست و پێی هەر کەسێکی لە خەودا لادانە لە هـەوار دەعـیە. مـاچکردنی پیاو سـوود پـێ گـەیاندنیتی ماچکردنی قورآنی پیرۆز رێز گرتنی سـەیدانە ماچکردنی کۆڕی پیاو چاکان

بڕوای پتەوە بە فەرمانی خوا. ماچکردنی ئاژەڵ هەرچێکی هەبێ دڵداری کردنە لەگەڵ بێوەژندا. ماچکردنی شتی بێ گیان بڕادەرایەتی کەسێکی زەبەللاحو بێ سوودە:

مندالْ بوون:

ئەگەر پیاوێ لای وابوو منداڵی بووە ئەوە تووشی دەردەسەری دەبێ ئەگەر ژنێک لای وابوو کچی بووە ئەوە دەوڵەمەند دەبێ ئەگەر لای وابوو کوڕی بووە ئەوە لای مێردی بەختەوەر دەبێ مردنی منداڵ لە خەودا غەمێکی کەمەو دەڕوات ئەگەر ژنێک لای وابوو کوڕی بوو و قسەی لەگەڵ کرد ئەو ژنە کوڕێکێ زاناو دینداری دەبێ.

مشەمش:

کەسێک لای وابوو لە خەودا مشەمشی دەکرد ئەوە دەیەوێ کاری بکات بەدزیو بەڵام زوو ئاشکرا دەبێ.

مرخە نوێڵ:

کەسێک لای وابوو خەریکە بە مرخە بەرد هەڵ ئەنێ ئەوە یارمەتی کەسێکی دڵ ڕەق دەکات بۆ جێبەجێ بوونی کاری خۆی واتە کاری دڵ ڕەقە کە شکانو خوار بوونی مرخە بێهێزی خاوەنەکەیەتی

میــوان:

کەسێک لای وابوو میوانی هاتووە ئەگەر ژنی ئاووسی هەبێ ئەوە منداڵی دەبێ و منداڵەکەش نازی ئەگەرنا خێرو بەرەکەتە

مامۆستا: مەلا:

دیتنی مامۆستا لە خەودا شادی و خۆشی‌یە. مردنی مامۆستا کەم بوونی زانیاری‌یە. بوون بە مامۆستا لە خەودا دەست کەوتنی پایەی بەرزە.

مەنی: تۆی ئادەمی:

کەسێ لای وابوو مەنی لێ هاتە دەرێ ئەوە دەوڵەمەند دەبێ ئەگەر کەسێ مەنی بە ژنێک داکرد ئەو ژنە قازانجی پێ دەگات لە لایان کابراوە. ئەگەر کەسێ مەنی کەسێک بکەوێتە دەستی سوود لە خاوەن مەنی دەبینێ. خواردنی مەنی تەمەن درێژی‌یە. کەسێ لای وابوو مەنی ژنی خۆی بە سەردا ڕژا ئەوە ژنەکە قازانج بە مێردەکەی دەگەیێنێ:

مەتران:

بڕوانە قەشە:

مزەورە:

خواردنی لە خەودا ئەگەر بەتام و خۆش بوو ژیانی شادی‌یە بەڵام ئەگەر بێ تام بوو ژیانی دەردەسەری‌یە:

مێرگ چەمەن چیمەن:

گەڕان لە ناو مێرگ یان نووستن ڕابواردنی ژیانی شادی و خۆشی‌یە گەڕان لە مێرگێک بۆ یەکێتر. خەبات کردنە بۆ دینداری بەڵام ئەنجامی واز دەهێنێ و ڕوو دەکاتە خەراپە کردن:

مـژین:
مژینی شتی شیرین دینداری پتەوە بەلام هی ترش‌و تاڵ غـەم‌و دەردە هی سوێر تووشبوونی نەخۆشی‌یە.

مەساسە: بێڵەقان: پیشـک:
کەسێک لای وابوو خەریکە شـتێک بـە مـەساسـە هـەڵ بقەنێ ئـەوە تیربازی دەکات لە گەڵ منداڵان شـکانی مەساسـە کەم هێزی‌یە بۆ کاروباری ژیان.

مەیخانە: شەراب خانە:
چوونی مەیخانە لە خەودا بۆ مەی خواردنەوە کەم دینی‌یە نووستن لە مەیخانە دینداری‌یە ڕووخانی مەیخانە زۆر بوونی کرداری ئاینی‌یە.

مـەیگێڕ:
کەسێ لای وابوو مەی دەدات بە خەڵک ئەوە قسـەی دڵ خۆشـکەر بۆ خەڵک دەکات.

مەی فرۆش:
کەسێ لای وابوو بوویتە مەی فرۆش ئەوە یان خـۆی یـان خـزمێکی دەبێتە مۆسیقا ژەن.

ماڵ بار کردن:
لە دێهات بۆ شار دەوڵەمەندی‌یە. لە شار بۆ دێـهات هـەژاری‌یـە. بـار کردن لە وولاتێ بۆ وولاتی مردنی بار کەرە.

موژدە: مزگێنی:

کەسێک لە خەودا لای وابوو موژدەیێکی خۆشی بۆ هات ئەوە ڕوو دەکاتە خواپەرستی بەڵام ئەگەر لای وابوو منداڵ موژدەی خۆشی بۆ هێنا ئەوە لە لای سەرۆکی هەرێم ماڵی دونیای دەست دەکەوێ.

مەڕ مەڕ..

دەست کەوتنی بەردی مەڕ مەڕی سپی پەیدا بوونی برادەرێکی دیندارە هی سوور برادەرێکی کەم دینە. هی بۆر برادەرێکی دوو ڕووە هی زەرد برادەرێکی دڵ پیسە: دروست کردنی خانوو بە بەردی مەڕمەڕ مارە کردنی بێوەژنە کە ماڵی دونیای زۆرە:

مەلاشوو:

مەلاشوو هێنانی لە خەودا لادانە لە فەرمانی خوای گەورە.

مێوژ:

خواردنی لە خەودا بەدەست کەوتنی ڕزقی باشوو زۆرە فرۆشتنی مێوژ بارمەتی دانی هەژارانە. دیتنی مێوژ فرۆش عالمێکی دینی‌یە کە سوودی هەیە بۆ کۆمەڵ.

ماڵ ئاوایی:

ئەگەر کەسێک لای وابوو لە خەودا ماڵ ئاوای لە کەسێک کرد ئەوە دەبێتە زاوای کەسەکە. ماڵ ئاوایی کردنی ژن لە مێردی خۆی تەڵاقدانی ژنەکەیە. بەڵام هی پیاو لە ژنی خۆی دینداری‌یە بە دڵ سۆزی:

# « پیتی نون »

نوح پێغەمبەر:

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا تەمەنێکی درێژی بە ئازارە دیتن لە هەرێمێکی کەم باران باران بارینی زۆرە. ئەگەر ژنێ بە خزمەتی گەیشت ئەوە کوڕێکی دەبێ بەڵام کافر دەبێ وە ژنەکەش لە فەرمانی مێردی لادەدا: هەروەها دیتنی نوح هەرزان بوونی نرخی دەغلو دانە:

نور: ڕوناکی:

دیتنی هەر جۆرە نورێک لە خەودا ژیانی خۆشە.

نانەوا:

کەسێک لای وابوو بوونە نانەوا ئەوە ئیشو کاری هەژاران دەکات بۆ خوا.

نوێژ:

نوێژ کردنی بە چاکی لە خەودا ڕەزامەندی خوایە لە نوێژ کەرەکە بەڵام نوێژ کردن بە نوقسانی لادانە لە فەرمانی خوا کردنی نوێژی هەموو جۆرە سونەت گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرە(د.خ) نوێژ کردن ڕوو بە ڕۆژهەڵات کردنی دینداری‌یە بەڵام بە ڕیابازی: نوێژ کردن لە جێگەی تاریک لادانە لە

فەرمانی خوا. کردنی نوێژی مردووو. بارانەو نوێژی جەژنەو تەراویحو هاتنەوە لە سەفەر هەمووی ماناى دینداری تەواوی نوێژکەرەکەیە.

ناشکوری کردن:

ناشکوری کردن لە خەودا بەرانبەری هەرچی هەبێ غەزەبی خوایە لە ناشکوری کەرەکە:

ناو:

کەسێک لای وابوو لە خەودا بە ناوی خۆی بانگ نەدەکرا بەڵکو ناوێکی تریان لێنابوو جا ئەگەر ناوە نوێیە کە خۆشبوو وەک شادمان. رزگار. ئومێد. ئەوە ئەو کەسە زۆر بەخۆشی دەژی بەلآم ئەگەر ناوەکە ناخۆشی بوو وەک پەشێو. ناکام. غەمبار. هەژار ئەوە تووشی کوێرەوەری و ژیانی دژوار دەبێ.

نزوره:

موو هەڵ قەندن بە نزوره بۆ پیاو دینداری یە بۆ ژن غەمە.

نووسین:

نووسین لە خەودا هی شتی باش ناو دەرکردنی نووسەرە بە باشی بەلآم نووسینی شتی خراپ ئاژاوە دروست کردنە بۆ خەڵکی بێ تاوان کەسێک لای وابوو شتێکی نووسیو ڕەشی کردەوە ئەوە تۆبە دەکات لە کرداری درو زمانی لە ناو عالەمدا.

**نیشانە: ئامانج:**

ئەنگاوتنی نیشانە بە بەرد یان تفەنگ گەیشتنە بە ئاوات بە ئاسانی.

**ناشتنی مردوو:**

ناشتنی مردوو لە خەودا دانانی ئەسپاردەیە لە لای کەسێکی ئەمین.

**نەمام:**

چاندنی هەر نەمامێک لە خەودا پارمەتی دانی هەژارانە بە زمان‌و بە دڵ شکاندن‌و بڕینی نەمام زۆرداری کردنە لە بێ تاوانان.

**نزگرە: بەسنچکە: دەڵک:**

تووش بوونی نزگەرە لە خەودا پارمەتی دانی زۆردارانە بۆ زۆرداری. هەروەها نزگرەی بەهێز مردنی کابرایە.

**ناوبژی کردن: بەرڕەوانی:**

ناوبژی کردن لە نێوان دوو کەسی شەڕکەر یان ناحەز ئەوە فەرمان کردنە بە چاکەو بەرگرییە لە خەراپە لە لایان ناوبژی کەرەوە.

**نۆک:**

خواردنی لە خەودا دەست کەوتنی ماڵی دوونیایە بەڵام خواردنی بە گەرمیو کوڵاوی ماچکردنی ژنی خزیەتی لە ڕەمەزاندا کە هەردووکیان بە ڕۆژوون.

ناورک:

هێشانی لە خەودا مردنی باوکی خاوەن ناوکە یان مردنی داکیتی ئەگەر کەسێکی نەخۆش لای وابوو ناوکی کون بووە ئەوە دەمرێ. کەسێک لە وڵاتی غەریبی لای وابوو ناوکی دیشێ دەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی.

نینۆک:

جوانی لە خەودا ژیانی شادیە: درێژ بوونی کەم دینیە کردنی نینۆک لە خەودا گرتنی ڕێگەی شەریعەتی ئیسلامە ناڕێکی لە خەوداکەم دینیە:

نووشتە:

کەسێک لای وابوو مەلایێک نووشتەی بۆ دەکرد ئەگەر نووسینی شتی پیرۆز بوو ئەوە نووشتەکەرەکە دەبێتە پشت گیری کابرا لە کاروباری ژیاندا بەڵام ئەگەر نووسینی نوشتە شتی پڕوو پوچ بوو ئەوە بە دواکەوتنی شتی نالەبارە لە لایان نووشتە بۆ کراوەکە:

نووستن: خەوتن:

بنواڕە خەوتن

نــەرد:

یاری کردنی نەرد لە خەودا بە فیرۆ دانی ماڵی دونیایە.

ناقۆس:

[illegible] دەلەسەیە لە لایان ناقوس لێدەر:

نەورۆز:

کەسێک لای وابوو جەژنی نەورۆزی دی لە خەودا ئەو شتەی لێ ی ون بووە دەی دۆزێتەوە ئاهەنگ کردن بۆ نەورۆز شادی یە بۆ کۆمەڵ.

نارنج:

خواردنو چاندنو بۆن کردنی حەز لێ کردنی ژنێکە کە پێ ی ناشێ وەک خۆشکی ژنی بۆ نمونە: هەروەها گوشین نارنج تووش بوون دەردوو غەمە:

نیلی میسر:

خواردنەوەی ئاوو خۆ شوشتنیو مەلە کردن لە نیلی میسر دەست کەوتنی پایەی مەزنو خۆش یە:

نەوت: نەفت:

کەسێک لای وابوو نەوت دەسووتێنێ ئەوە تەمەنی لە شتی بێ سوود سەرف دەکات. ئەگەر لای وابوو نەوتیان بە سەرا کرد ئەوە لە لایان کاربەدەستی میری تووشی ئازاردان دەبێ. دۆزینەوەی نەوت لە زەویدا کشتوکاڵ کردنە لە زەوی زەوت کراو لە خاوەنەکەی. خواردنەوەی نەوت: خواردنی ماڵی حەرامە.

نەعل:

لە پێ کردنی نەعلی زەرد مارە کردنی ژنێکی دەردەوارە هی سەوز مارە کردنی ژنی دیندارە. هی ڕەش مارە کردنی ژنی دەوڵەمەندە. هی سوور

زنی کەم دینە. بزر بوونی ئەعل تەلاقدانی زنی خاوەنێتی. دەست کەوتنی ئەعلی زێر زنی جوانە هی زیو ماڵ دونیایە هی چەرم ژیانی خۆشە.

ناڵەناڵ:

لە خەودا ناڵەناڵ کردن ئەگەر لە بەر نەخۆشی بوو ئەوە لە لایان زۆردار غەدری لێ دەکرێت ئەگەر لە بەر بریندارێ بوو ئەوە بوختانیان پێی کردووەو بەڵام زوو دەردەکەوێ.

نشتەر:

لێدانی نشتەر لە هەر کەسێک لە خەودا دڵ شکاندنی کابرایە بە قسە پێ وتنی ناخۆش.

نێزە:

بەدەست کەوتنی. پەیدا کردنی برادەرێکی بە ئەمەکە..

نـــان:

خواردنی نان لە خەودا تەمەن درێژییە هەبوونی نانو نەخواردنی ئازاردانی خزمی خۆیەتی. خواردنی نانی زۆر گەرم تووش بوونی غەمە. خواردنی نانی جۆوو هەرزنو نۆکو نیسک و زیوان خێر کردنە بە هەژاران بە زۆری و دڵسۆزی...

نیـــسک:

خواردنی لە خەوداگرتنی ڕێبازی پێغەمبەرانە.. چاندنیو درەو کردنی

نیــک له خه‌ودا تووش بوونی ژیانی به‌ده‌رده‌سه‌ری‌یه به‌لاَم ئه‌نجام ڕزگار بوونه.

نه‌نک: داپیره:

دیتنی نه‌نک له خه‌ودا گه‌یشتنه به ئاوات ئه‌گـه‌ر کـه‌سێک لای وابـوو نه‌نکی شتێکی دایه ئه‌وه که‌سێک ده‌یه‌وێت له پێناوی دۆستایه‌تی فێڵی لێ بکات.

نـــاڵ:

که‌سێک لای وابوو وولاَخی خۆی ناڵ کرد ئه‌وه به شـه‌هیـدی ده‌مـرێ ئه‌گه‌ر لای وابوو ناڵی زێڕی له پێی وولاَغدا ئه‌وه ڕووده‌کاته دینداری. که‌سێ لای وابوو ناڵی له پێی وولاَغ کرده‌وه ئه‌وه ئازاری دایکی ده‌دا به زۆری.

نـامــه:

که‌سێک لای وابوو نامه‌ی بۆ که‌سێک نووسی هه‌ر چۆنێ هه‌بێ ئه‌وه یان خۆشکی یان کچی یا خزمێکی ماره ده‌کات بۆ نووسه‌ره‌که نووسه‌ره‌که.

# « پیتی واو »

**وێنەگر:**

کەسێک لای وابوو بوویتە وێنەگر ئەوە بە دوای عەیبی خەڵک دا دەگەڕێ. کەسێک لای وابوو وێنەی ژنێکی بە دەستەوەیە ئەوە بیر کردنەوەیە لە دەوڵەمەندیو. نایگاتێ بەڵام ئەگەر وێنەی پیاو بوو ئەوە دەیەوێت ئاژاوەیەک بۆ کەسێکی بێ تاوان درووست بکات کە خۆی تووشی زیان دەبێ. ڕەش بوونەوەی وێنەی هەر کەسێک مردنی خاوەن وێنەکەیە بە زوویی دۆزینەوەی وێنەیی هەرکەس دۆزینەوەی ئەو پارەیە کە ونی کردووە:

**ون بوون: بزر بوون: گوم بوون:**

کەسێک لای وابوو شتێکی لێ ون بووە ئەوە گوناحێکی گەورە دەکات ئەگەر شتەکەی دۆزیەوە ئەوە تۆبە دەکات:

**وەرس:**

کەسێ لای وابوو وەڕسە لە خەوردا لە هەر شتێک ئەوە لەماڵی ئاژاوەی هەیە:

**وڵە: جۆبرکە: کەڵەپەز:**

کەسێک لای وابو جۆبرکەی کوشت ئەوە یارمەتی جووتیار دەدا بە

ماڵی دونیا زۆر بوونی کەڵەپەز بێ دەرامەتی کشت و کاڵی ساڵە:

**وەرگرتن:**

کەسێک لای وابوو شتێکی لە کەسێک وەرگرت ئەوە خۆشییەکی کەمەو دەڕوات:

**وەرگەڕان:**

کەسێک لای وابوو لە خەودا لە سەر پشت کەوتە سەر زگ ئەوە هاوەڵ بۆ خوا چێ دەکات و بە بێ بڕوا دەمرێ بەڵام وەرگەڕان لە سەر زگ بۆ سەر پشت تۆبە کردنە لە گوناحان.

**وەرددانەوە:**

کەسێک لای وابوو زەوی وەردەدانەوە بۆ تۆو کردنی ئەوە دەچێتە حەجوو لەوێ دەمرێ:

**وازی: یاری: گەمە:**

کردنی هەر جۆرە وازێک لە خەودا ژیانی شادیو دەست کەوتنی ماڵی دونیایە:

**ووشتر: حوشتر:**

دیتنی لە خەودا سەفەر کردنە لە بیابان و تووشی کوێرەوەری بوونە کوشتنەوەی ووشتر سەرکەوتنە بە سەر ناحەزدا خواردنی گوشتی خواردنی ماڵی حەرامە:

# « پیتی هی »

**هارون پێغەمبەر د.خ:**

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا تووش بوونی ئازارو خەمە لە لایەن هەندی کەسێ نارەسەن و کەم دین:

**هود پێغەمبەر د.خ:**

بە خزمەت گەیشتنی تووش بوونی بەربەرەکانی یە لە گەڵ کەسێکی زۆردار کە لە ئەنجامدا زاڵ دەبێ بە سەر زۆردارەکەدا.

**هابیل:**

بە خزمەت گەیشتنی مارە کردنی ژنێکی لاسارە: یان بە ناحەق دەکوژرێ.

**هەرمێ:**

خواردنی هەرمی کە زەرد نەبێ دەست کەوتنی ماڵی دونیایە بەلام هی زەرد تووش بوونی نەخۆشی یە: چاندنی نەمامی هەرمێ خزمەت کردنی ئەوان هەتیوانە.

هێلانه:

دیتنی هێلانەی هەر باڵندەیەکی لە خەودا خزمەت کردنی باب و داکە بەڵام تێکدانی لادانە لە فەرمانی خوای مەزن.

هەرس: وورچ: حورچ:

کوشتنی هەرس لە خەودا زاڵ بوونە بە سەر دووژمندا گۆشت خواردنی هەرس نیاز کردنی دزییە لە ماڵی مزگەوت گانی هەرس ئاشت بوونەوەیە لەگەڵ ناحەز: شەڕ کردن لەگەڵ هەرس گرتنی ڕۆژوی سونەتە.

هەڵ خلیسکان بەربوونەوە:

کەسێک لە خەویدا لای وابوو لە ڕۆیشتندا هەڵ خلیسکا ئەوە ئەو ئیشەی کە خەریکە بیکات سەر ناکەوێ ئەگەر لای وابوو کەسێک دەستی گرت و ڕاستی کردەوە ئەوە بە هۆی کەسێکەوە دەگاتە ئاوات.

هاوار:

ئەگەر کەسێک هاواری کرد لە ناو کۆمەڵێک ئەوە دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵە کە بەڵام هاوار کردن بە تەنیا لە دەست چوونی پایەی بەرزە:

هەوار:

کەسی لای وابوو گەڕایەوە ئەو هەوارەی بە جێی هێشتبوو ئەوە دەگەڕێتەوە ئەو کردەوانەی وازی لیان هێنابوو.

هاری:

هار بوون لە خەودا لادانە لە دینداری:

هێزەی روون:

بەدەست کەوتنی لە خەودا فەرماندانە بە چاکەو خۆ لەبیر کردنە بۆ چاکە کردن درانی هێزەی ڕوون کەسێکە کە خۆی بە زانیار دەزانێ بەڵام زۆر نەزانە یانی خاوەن هێزەکە:

هەویر:

کردنی هەویر لە خەودا هاتنی میوانی پایە بەرزە بۆ لای هەویر شێلان لە قاپی تەسکدا بەدوا کەوتنی ئیرجازی‌یە لە شتی فراواندا مارە کردنی کچە لە خۆی ئەنگوشکی هەویر کردن دەوڵەمەندی‌یە.

هۆزەبانە: گوێزەبانە:

بەشی‌نەوەی هەر شتێک بە بۆنەی منداڵ بوون بە ناوی هۆزەبانە لە خەودا بەدوا کەوتنی فەرمودەی پێغەمبەرە.

هەنگوین:

خواردنی لە خەودا تەن دروستی‌یە دیتنەوەی شانەی هەنگوین دۆزینەوەی زێڕە لە بن گڵ: خواردنی هەنگوینی سپی دینداری کردنە بە دڵ سۆزی.

هەوراز: رِک:

کەسێک لای وابوو لە هەورازێ بە سەرکەوت ئەوە مردنی نزیک بویتەوە ئەگەر لای وابوو بە سواری وولاغ بە سەرکەوت ئەوە ژنێک مارە دەکات بەڵام زۆر بە زەحمەت دەستی دەکەوێ.

**هەڵامەت:**

تووشبوونی لە خەودا بەدەست کەوتنی ماڵێکی کەمە.

**هەڵاڵە:**

بۆن کردنی لە خەودا تووش بوونی نەخۆشی‌یە.

**هورێنە: وورێنە چەین و بەین:**

کەسێک لای وابوو لە خەویا هورێنە دەکات ئەوە بەدوا کەوتنی شتی بێ سوودە هەروەها قسە کردنی بێ کەڵکە.

**هەرزن:**

خواردنو چاندنو دوورینەوەی نرخ گران بوونی دەغلودانە.

**هەناسە:**

بۆ ژن بەستنی خۆشەویستی بە لای مێردی. بۆ پیار تووش بوونی غەمە.

**هەوێ:**

ژنێک لای وابوو لە خەویا هەوێی بە سەرهات ئەوە کچێکی دەبێ: مردنی هەوێ مردنی کچە.

**هۆدە:**

کەسێک لای وابوو لە ناو هۆدەی خۆیەتی ئەوە دینداری پتەو دەبێ

ڕووخانی هزدە لادانی خاوەنەکەیەتی لە فەرمانی خوا.

هــەواە:

کەسێک لای وابوو لە ناو هەوادا دەڕوات یان وەستاوە ئەوە پایەی بەرز دەبێ مژینی هەوا کردنی کاری بێ ئەجامە فڕین لە ناو هەوادا پایە بەرزی‌یە.

هەریسە کەشکەک:

خواردنی بۆ نەخۆش مردنە بۆ مەلا کەم زانیاری‌یە بۆ جووتیار کەم دەرامەتی‌یە بۆ عەسکەر تووش بوونی شەڕو سەرنەکەوتنە.

هاوین:

دیتنی هاوین لە کاتی خۆی خێرو بەرەکەتە. بەڵام دیتنی بە ساردی تووش بوونی میوەجاتە بۆ نەخۆشی و کەم دەرامەتی. دیتنی هاوین بە گەرمی زۆر بوونی دەرامەتی شینایی و کشت و کاڵە.

هەمبان:

درووست کردنی ئاگاداری ئەسپاردەی خەڵکە دڕانی خەیانەت کردنە لە ئاسپاردە.

هەنجیر: هەژیر:

خواردنی هەمرو جۆری لە خەودا دەوڵەمەندی و تەن درووستی و ژیانی خۆشە دانیشتنی لە بن داری هەنجیر پەشیمان بوونەوەیە لە کرداری خەراپ بڕینی هەنجیر لادانە لە فەرمانی خوا.

**هەڵوچە:**

خواردنی بۆ نەخۆشی تەن درووستی‌بە هەروەها خواردن بۆ هەموو کەس زۆر باشە.

**هەنار: ئەنارۆک:**

خواردنی هەناری شیرین دەست کەوتنی ڕزقی حەڵاڵە هی ترش تووش بوونی غەمە چاندنی نەمامی هەناری شیرین مارە کردنی ژنێکی کابانو ئادامە. بەڵام هی ترش مارە کردنی ژنێکی بێ‌هۆشە:

**هێشوو: ووشی: گوێشی:**

بەدەست کەوتنی هێشوی تری بەدەست کەوتنی ماڵی دونیایە بەڵام هێشوی خورما بەدەست کەوتنی حەج کردنە بە ماڵی حەلاڵ.

**هێڵەک:**

ئارد لە هێڵەک کردن دەرکردنی زەکاتی ماڵە خۆڵ لە هێڵەک کردن خێر کردنە بە ماڵی حەرام شکانی هێڵەک لادانی خاوەنێتی لە فەرمانی خوای مەزن.

**هێلکە:**

خواردنی هەر جۆرە هێلکەیێک بە کاڵی خواردنی ماڵی حەرامە یان زینا کردنە کەسێک لای وابوو هێلکەی بەدەستەوەیە ئەوە ژنەکەی تووشی دەردێکی سامناک دەبێ خواردنی هێلکە بە پەلکەوە دزی کردنە. کەسێک لای وابوو ژنەکەی هێلکەی کرد ئەوە کوڕێکی کافری دەبێ: هێلکە نانەوە

لە بن مریشک کردنی ـ کارێکە کە سوودی هەیە بۆ دوورا ڕۆژی ـ کەسێک لای وابوو هێلکەی بە پەلکەوە خوارد بەڵام قوتی نەدا ئەوە واز لە دزی کردن دەهێنێ کەسێ لای وابوو هێلکەی زۆری لایە لە ئیشو کاری خۆی سەرناکەوێ خواردنی هێلکە بە برزاوی پەیدا بوونی دەردە بۆ ژنانی هەرنمەکە یان بەدیل گرتنیانە لە لایەن دوژمنەوە.

هەتیو: هەتیم:

دیتنی هەتیو لە خەودا غەمبارییە کەسێ لای وابوو دەستی بە سەری هەتیودا هێنا ئەوە خێر کردنە بە هەژاران کەسێک لای وابوو سەری هەتیوی دەتراشی ئەوە بەری خۆی دەتراشی.

هەیوان:

کردنی هەیوان بەقوڕ مارەکردنی ژنێکی دیندارە. بە گەچ نووش بوونی غەمە بە خشتی سوورەوە کراو خواردنی ماڵی حەرامە ڕووخانی هەیوان مردنی مامی خاوەنەکەیەتی: جوانی هەیوان ژیانی شادی خاوەنیتی.

هاون:

دەست کەوتنی هاون لە خەودا جێبەجێ بوونی ئەو مەبەستەی کە بۆی هەوڵ دەدات دەست کەوتنی هاونی زێڕ پایەی بەرزە بۆ کابرا. شکانی هاون مردنی ئەو لادی خاوەنەکەیەتی.

هەور:

دیتنی هەوری ڕەش تووش بوونی غەمە بەڵام هەوری سوور پەیدا بوونی شەڕوو کوشتارە. هەوری سپی خۆشیو شادییە بۆ خەڵکی

هەرنمەکە. پەیدا بوونی هەوری ئاگردار لە هەرنمێک زاڵ بوونی دووژمنە بە سەر هەرنمەکەدا سوار بوونی هەور زیاد بوونی زاناریبە چوونە ناو هەور برادەرایەتی خەڵکی دیندارە خانوو کردن لە ناو هەوردا دەست کەوتنی پایەی بەرزە:

# « پیتی یی »

یەعقوب پێغەمبەر (د.خ):

دیتنو بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا پتەو بوونی ئیمانە بە خوای گەورە. یان بە کەسرو کاری خۆی شاد دەبێتەوە.

یان بە هۆی ون بوونی کوڕێکیەوە تووشی غەم دەبێ هەروەها دیتنی لە خەودا لە هەرێمێک گران بوونی نرخی دەغلودانە ئەگەر ژنێک لە خەودا بە خزمەتی بگات ئەوە کوڕێکی دەبێ کە تووشی دەردەسەری دەبێ بەڵام ئەنجام پلەی بەرزی دەبێ.

یوسف پێغەمبەر (د.خ):

کەسێک بە ڕووی گەش و خۆش لە خەودا ببینێ ئەوە پلەی بەرزی دەست دەکەوێ بەڵام دیتنی بەڕووی گرژەوە لە هەرێمێک داهاتنی گرانی دەغلودانە ئەگەر ژنێک لە خەودا دیتی ئەوە کوڕێکی دەبێ کە دەبێتە کاربەدەستێکی مەزن ئەگەر منداڵ لە خەوی دیت ئەوە براکانی حەسوودی پێ دەبەن و دەیانەوێ لە ناوی بەرن ئەگەر کەسێک لای وابوو کەراسی یوسفی کەوتە دەست ئەگەر کوێر بێ چاک دەبێتەوە ئەگەر غەمبار بێ شاد دەبێ ئەگەر یوسف شتێکی دایە ئەوە یان دەبێتە وەزیر یان عالمی خەون یان ژنێکی جوان دەهێنێ.

**یونس پێغەمبەر (د.خ):**

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا تووش بوونی غەم و خەفەتە بەڵام ئەنجامی شادی و خۆشی یە:

**یەحیا پێغەمبەر (د.خ):**

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا شادی و مردنی بە ئیمانەوەیە هەروەها لە بەرکردنی قورانی پیرۆزە:

**یاقوت:**

بەدەست کەوتنی لە خەودا دینداری یە کەسێک لای وابوو ئەقیمی ئەنگوستیلەی یاقوتە ژنێکی جوان مارە دەکات:

**یاڵ: بژی:**

کەسێک لای وابوو لە هەرێمێک ماینێکی دیت کە یاڵی جوانی هەبوو ئەوە ژنێک دەبێتە کاربەدەستی ئەو هەرێمە. بەڵام ئەگەر ئەسپی دیت بەم جۆرە ئەوە پیاوێک دەبێتە کاربەدەستی هەرێمەکە:

**یوشەع پێغەمبەر (د.خ):**

بە خزمەت گەیشتنی لە خەودا گرتنی ڕێبازی دیندارانە تۆبە کردنە لە گوناهان: